ناوی کتێب: گفتوگۆیەك لەگەڵ هایدیگەردا
وەرگێڕانی : د. محەمەد کەمال
بابەت: گفتوگۆ
بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولرەحمان
هەڵەچنی: مهاباد رەحیم
بەرگ: قادر میرخان
سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد رەفیق
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ٥١٦ی ٢٠٠٥
چاپی : یەکەم ساڵی ٢٠٠٥
کوردستان -سلێمانی
www.sardam.info



# گفتوگۆیەك لەگەڵ هایدیگەردا

وەرگێڕانی لە ئەڵمانیەوە بۆ ئینگلیزی

**ماریا ئەلتەروجۆن کاپوتۆ**

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

**د. محەمەد کەمال**

پێشەکی

**ئازاد بەرزنجی**

سلێمانی- ٢٠٠٥



# مارتن هایدیگەر

مارتن هایدیگەر (١٨٨٩-١٩٧٦) بە یەکێك لە گەورە فەیلەسووفەکانی سەدەی بیستەم دەژمێردرێ. فەیلەسووفێك کە بیروبۆچوونەکانی کاریگەریی نەك هەر لەسەر هزری فەلسەفیی دوای خۆی جێهێشتووە، بەڵکو لەسەر گەلێ بواری تری وەکو هێرمنیۆتیكو ئیستاتیكو بونیادشکێنیو دەروونناسیو ڕەخنەی ئەدەبیو هتد..

هایدیگەر لە سەرەتای لاوێتیدا خوێندکاری خوداناسیی کاتۆلیك بوو، بەڵام دواتر بەرگی ئاینی لەبەر خۆی داکەندو لەم ڕووشەوە لەژێر کاریگەریی مامۆستاکەی (واتە ئەدمۆند هۆسێرل)دا بوو، کە باوەڕی وابوو فینۆمینۆلۆجیا دەبێ خۆی لە ئایین جیابکاتەوە.

هایدیگەر دوای یەکەم جەنگی جیهانی لە هۆسێرل نزیك بۆوەو لە ساڵی ١٩١٩ەوە وەکو یاریدەدەری هۆسێرل لە زانکۆی فرایبۆرگ وانەی دەوتەوە.

هایدیگــەر کتێبەکــەی هۆســێرل (توێژینــەوە لۆجیکیــەکان)ی خوێنــدبۆوەو لــە زۆر ڕووەوە بیروبۆچوونەکانی ئەو کتێبە کاری تێکردبوو. ئەمە جگــە لــەوەی کــە نــابێ ئــەوەمان لــەبیر بچــێت کــە هۆسێرل باوەڕی وابوو کە بابەتی سەرەکیی فەلسەفە (خــودێتی) نییــە، بــەڵکو (دیــاردە)کــانو هــەر بۆیــە میتۆدی وەسفکردنی پێشنیازکرد، واتە وەسفکردنی دیاردەکــان بــۆ دەربــڕینو خســتنەڕووی چــیەتی (ماهیەت)یان.

لە ساڵی ١٩٣٣دا کاتێ هایدیگەر بوو بە سەرۆکی زانکۆی فرایبۆرگ بە هەڵکەوتوویی ڕابەری پێشەوا (فۆهرەر) واتە هیتلەردا هەڵیداو وای بینی کە نازیزم سەرەتای سەرهەڵدانی سیستمێکی نادینیو زەمینییە. ئەمــەش هەڵوێستێك بــوو کــە زۆر گــران لــە ســەری کەوتــەوەو ناحــەزەکانی بــۆ کەمکردنــەوە لــە دەوڵەمەنــدیی فەلسەفەکەی بــەکاریانهێنا. گەرچــی هــەروەکو لــەم گفتگۆیــەدا بەدەردەکــەوێت هایدیگــەر دواتــر لــەوە پەشــیمان بۆتــەوەو ڕەخنــەی لــە نــازیزم گرتــووەو تەنانــەت کەوتۆتــە ژێــر چاودێریشــیانەوە. لێرەدا پێویستە ئەوەش بڵێین کە ئێمە نابێ لە ڕێی

هەڵوێسـتی سیاسـیەوە فەلسـەفەی هایدیگـەر هەڵبسەنگێنین.

لـە سـاڵی ١٩٢٧دا بـوو کـە هایدیگـەر کتێبـە گەورەکـەی خـۆی (واتـە بـوونو زەمـان)ی نووسـیو پێشکەشی (هۆسێرل)ی کرد. بەڵام دواتر کە بوو بە مامۆستای زانکۆ پەیوەندیی لەگەڵ هۆسێرلدا بەرەو ساردی ڕۆیشتو پاشتر جیاوازیی نێوانیان بە زەقی لـە کتێبـەکانی (کانـتو مەسـەلەی میتافیزیـك) و (میتافیزیـك چـییە؟)دا دەرکـەوت. لەگـەڵ ئەمەشـدا کاریگـەریی میتـۆدی فینۆمینۆلـۆجی (دیاردەناسـی) بـووە شـێوازێکی کاریگـەر لای هایدیگـەر بـۆ پەردەهەڵماڵین لە ڕووی بوون.

بـەڵام کـام بـوون؟ هایدیگـەر زاراوەی (دازایـن Dasein) بـۆ بـوون بـەکاردێنێت کـە بـە مانـای (بـوون لەوێدا) دەگەیەنێت. ئەتوانین بڵێین کە ئەم زاراوەیە سـەرەکیترین زاراوە یـان چـەمکی فەلسـەفییە لای هایدیگـەر کـە خوێنـەر لـە ڕێیـەوە بـەرەو نـاو فەلسـەفەکەی دەچـێت. (دازایـن)یـش بریتییـە لـەو بوونەی کە لە ڕەوتی پەردەهـەڵماڵین لـە ڕووی بـوون بە گشتیو پەیبردن پێی مانا بە خۆی دەبەخشێت.

(دازاین)یش لە ڕەوتی (زەمان)دایە کە پەردە لە ڕووی خۆی هەڵدەماڵێت. ئەمەش نەك ئەوەی زەمان شتێك بێت لە دەرەوەی دازاین یان دازاین لە دەرەوەی زەماندا بێت، بەڵكو دەتوانین بڵێین کە دازاین زەمانمەندە، ئەم زەمانەش لە دازایندا لە یەك کاتدا هەرسێ ڕەهەندەکەی زەمان (واتە ڕابردوو، ئێستا، ئایندە) لەخۆدەگرێت.

دوو شێوازیش هەیە بۆ دازاین یان بوون کە لە هەڵوێستدا بەرامبەر بە (مردن) دیاریدەکرێن. ئەمانەش (بوونی ڕەسەن)و (بوونی ناڕەسەن)ن.

(دازاین) بوونە -لە- جیهاندا، بەڵام ئەم بوون -لە- جیهاندایە تایبەتمەندیی بەرجەستەی ڕۆژانەی ئێمەیە لەگەڵ جیهانداو هایدیگەر ئەم شێوازە یا پەیوەندییەش ناودەنێت (بایەخدان). لە ڕێی ئەم بایەخدانەی (دازاین)یشەوەیە کە شتەکانی ئەم جیهانە مۆرکی مرۆیی بە خۆیانەوە دەگرن‌و مانا پەیدا دەکەن‌و جیهانیش بۆ (دازاین) دەبێتە جیهانێکی ئامرازی. گەرچی لەم جیهانە ئامرازیەدا (دازاین) بە تەنها پەیوەندی لەگەڵ ئەو شتانەدا نابەستێت کە بەکاریان دەبات، بەڵكو پەیوەندی

لەگەڵ خەڵکانی تریشدا دەبەستێت. کەواتە هەروەکو چۆن دازاین بوونە -لە- جیهاندا، بەم جۆرە دازاین بوونە -لەگەڵ- ئەوانی تریشدا، واتە (لەگەڵ) سیفەتێکی گەوهەریی دازاینە.

نیگەرانیی ڕەسەن بۆ ئەوی تر یاریدەی ئەدات بگات بە ئازادیو بە هەڵبژاردنی ئیمکانە دانسقەکانی، بەڵام لە زۆربەی کاتدا ئەم پەیوەندییە لەگەڵ ئەوانی تردا پەیوەندییەکی بێبایەخەو دازاین دەچێتە ژێر گوشاری ئەو پێوەرو دابو نەریتو ڕێو ڕەسمانەوە کە (ئەوانیتر) دایانمەزراندووەو لە ڕێی میدیاو نێوەندە دەستەجەمعیەکانی ترەوە جۆرێك لە (یەکتەرزی) و (هاوچەشنی) بەسەر دازایندا دەسەپێنرێو لەم حاڵەتەشدا (دازاین) شێوازی بوونی نارەسەن بەخۆوە دەگرێت.

ئەمە لە کاتێکدا (دازاین) گەرچی بوونە -لە- جیهاندا، بەڵام وەکو بوونی ئاوێك نییە لە پەرداخێکدا، بەڵکو بوونێکە کە بە بێ جیهان نییەو جیهانیش بەبێ ئەو نییە، وەکو سێبەرو هەتاو*.

---

* بۆ پتر تێگەیشتن لە چەمکی بوون، خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە سەر بەشی سێیەمی کتێبی (فەلسەفەی





وتمـــان دوو شـــێواز بـــۆ بـــوون هەیـــە: بـــوونی نارەســـەنو بـــوونی ڕەســـەن. بـــوونی نارەســـەن چییە؟ مادامــەكی دازایــن بوونێكــە -لــە- جیهانــداو بوونــە -لەگــەڵ- ئــەوانیتردا، كەواتــە بوونێكــە ناتوانێــت بــە تەنیا هەبێت، كە نەشیتوانی بە تەنیا هەبێت ناچارە (لەگەڵ) (ئەوانیتر)دا بێت، هەر ئەمەش وای لێدەكات وەكو بابەتێكی لێبێت بۆ ئەوانو ببێتە ژمارەیەك لــە ژمارەكــانو یــەكێك لــە مێگــەلو پــەیڕەوی لــە دابو نـــەریتو بۆنـــەكان بكـــاتو ملكەچـــی دەســـتوورو تۆڕەكـانی كۆمــەڵگا بێــتو لــەم حاڵەتەشــدا دازایــن چەند زیاتر تێكەڵاو بێتو چەند زیاتر ملكەچی ئەو دابو نەریتو ڕێوڕەسمانـە بێت، ئەوەنـدە لـە دۆخـی (بوونی نارەسەن) نزیك دەبێتـەوە، بـەڵام ئـەم جـۆرە

---

بوونگـەرایی، جـۆن مـاكواری، وەرگێـڕان: ئـازاد بـەرزنجی، چاپی یەكەم، بەشی چاپو بڵاوكردنەوەی نەوا– ٢٠٠٥).
هەروەها بەشی یەكەمو دووەمی كتێبی (بوونو داهێنان)ی (د. محەمەد كـەمال) كە لـە چاپكراوەكانی دەزگـای چاپو پەخشـــی ســـەردەمە (ســـاڵی ٢٠٠٤). هـــەروەها كتـــێبی (چەمكی بوون لە مێـژووی فەلسەفەدا) د. محەمـەد كـەمال، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم ٢٠٠٣.





دۆخـــەش دۆخێکـــە کـــە (دازایـــن) تیـــا دەژی. لـــە ســــیفەتەکانی بــــوونی نارِەســــەنیش هەڵـــەوەڕیو لاپرەســـەنی (فزولـــی) و بەدحاڵیبوونـــە. هەڵـــەوەڕی لەوەوە دێ کە خەڵکی لە ژیـانی ڕۆژانـەدا پێویستیان بەوەیـە بـە زمانێـك لەگـەڵ یـەکتر بـدوێنو زۆربـەی قســەکردنەکانیش بــێ کــرۆكو بێمانـــانو دەچــنە خانەی (دەڵێن ئـەوە وابـوو و ئـەوە واچوو)ەوە. ئـەم حاڵەتی هەڵەوەڕییەش وا لـە دازایـن دەکـات بـە دوای شـتی تـازەدا بگـەڕێت تـا بیلێـت، هـەر بۆیـە پـەنا بـۆ فـــزوولێتی دەبـــاتو لاپرەســـەن دەبێـــتو دەیـــەوێ زانیاریی تازەی دەستبکەوێت، بـەڵام نـەك لـە پێنـاوی زانـــینو مەعریفـــەدا، بـــەڵکو لـــە پێنـــاوی کـــات بەسەربردنو پڕکردنەوەی بۆشاییدا. ئەمەش دەبێتە مایەی (بەدحاڵیبوون)، چونکە هەر کەسەو وا دەزانێ زانیـــاریی ڕاســـتەقینەو حەقیقـــەت لای ئـــەوە، بـەمجۆرەش بـەدحاڵیبوون دروسـت دەبێـت. هـەموو ئەمانەش دەبنە هۆی (کەوتن)ی دازاین.

ئـەی کەواتـە (بـوونی ڕەسـەن) چـییە؟ بـوونی ڕەسەن ئەو بوونەیە کـە هەسـت دەکـات بوونێکـە -لـە پێنـــاوی- مەرگـــدا، واتـــە بوونێکـــە لـــە

ڕووبەڕووبوونەوەیەکی بەردەوامدایە لەگەڵ مەرگا. مادامەکی بوونیش لە پێناوی مەرگدایە، دازاین هەستدەکات کە بوونی بوونێکی تێپەڕو کۆتادارەو لە بەردەم هەڕەشەی فەنابووندایە. ئەم هوشیارییە بە مەرگ وا لە دازاین دەکات لە سنوورەکانی بوونی خۆی ئاگامەند بێت. کەواتە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم ڕاستییەدا، نەك هەڵاتن لێی، ڕووکردنە بوونی ڕەسەنە. هەڵبەت بوونی ڕەسەنیش بەردەوام (دڕدۆنگی)یەکی لەگەڵدایەو جیاوازیی (دڕدۆنگی)یش لە ترس ئەوەیە، کە ترس بریتییە لە ترس لە شتێك، لە کاتێکا دڕدۆنگی ترس نییە لە شتێکی دیاریکراو.

دواجار مادامەکی دازاین بوونە -لە جیهانداو بوونە -لە پێناوی - مەرگدا، کەواتە بوونێکی زەمانمەندیشەو مێژووەکەشی لە نێوان لەدایکبوون و مەرگیدایە، بەڵام بوونێك نییە لەناو مێژوودا، بەڵکو بوونێکی مێژوودارەو مێژووەکەشی هەر ڕابردوو نییە، بەڵکو ڕابردوو و ئێستاو ئایندەیە. بە مانایەکی تر دەتوانین بڵێین مێژوو خۆی بریتییە لە دازاین و هەموو شوێن و ڕووداوەکانیش مانای مێژوویی خۆیان





لـە پەیوەندییـەوە بـە مرۆڤـەوە وەردەگـرن. کەواتـە مێــژووی ئــەم مێــژووی جیهانــەو هــەر لــە ڕێــی ئەمیشـەوەیە کـە مێـژوو و شـتەکان مانـا وەردەگـرن. گەرچـی دازایـن لـە (بـوونی نارەسـەن)دا وا دەزانـێ مێــژووی ئــەم پاشــکۆی مێــژووی جیهانــە. ئەمــە کورتەیـەك بـوو سـەبارەت بـە هێڵـە سـەرەکیەکانی هـزری هایدیگـەر کـە بـە پێویسـتمان زانـی بیخەینـە بەرچاوی خوێنەر، تا وێنەیـەکی دەربـارەی هایدیگـەر لە زەینـدا بێت بەر لە خوێندنەوەی ئـەم گفتوگۆیـەی کــە کــاتی خــۆی گۆڤــاری (دێرشــپیگل)ی ئــەڵمانی لەگەڵیــدا ســازی داوەو (د. محەمــەد کــەمال) لــە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە.

هەڵبــەت گرنگیــی ئــەم گفتوگۆیــەش (کــە دوای مــەرگی هایدیگــەر بڵاوکرایــەوە) لــەوەوە دێــت کــە تیایـدا هایدیگـەر سـەبارەت بـە هۆیـەکانی بـوونی بـە سەرۆکی زانکۆ (لە ١٩٣٣) ئەدوێت کە هاوکاتـە لەگـەڵ دەسەڵات گرتنە دەستی هیتلەرو هـەروەها هاوسـۆزیی ئەودەمــەی لەگــەڵ ڕایخــداو تاوانبــارکردنی بــە ســـووتاندنی کتـــێبی نووســـەرە جوولەکـــەکانو پەیوەندییـەکانی لەگـەڵ هـەردوو فەیلەسـووف (کـارل

یاسپەرز) و (ئەدمۆند هۆسێرل)دا. پاشان هەر لەم گفتوگۆیەدا ئەوە ئاشکرا دەکات کە چۆن دواترو لە ساڵانی ١٩٣٦-١٩٣٧دا، کاتێ وانەی لەسەر (نیچە) گوتووەتەوە، دژی نازیەکان دواوەو تەنانەت خراوەتە ژێر چاودێرییانەوە.

ئەمە جگە لەوەی کە هەر لەم گفتوگۆیەدا ئاماژە بۆ ڕۆڵی بیرمەندو فەیلەسووفو هەروەها پەیوەندییەکانی نێوان شیعرو تەکنۆلۆژیا دەکرێ.

هەر بۆیە ئەم گفتوگۆیە بە یەکێك لە گرنگترین گفتوگۆکان دەژمێردرێ کە لەگەڵ (مارتن هایدیگەر)ی فەیلەسووفدا ئەنجام دراوە.

**ئازاد بەرزنجی**

## ژیانی هایدیگەر لە چەند دێڕێکدا

١٨٨٩ لە ٢٦ی سێپتامبەردا لەدایك دەبێت.

١٩٠٣-١٩٠٦ لە کۆنستانس دەچێتە جیمنازیوم (ئامادەیی زانستە مرۆییەکان)

١٩١١-١٩١٣ لە فرایبۆرگ خەریکی خوێندنی فەلسەفەو زانستە مرۆییەکان دەبێت.

١٩١٧ لەگەڵ ئەلفرێدە پێتری دا ژیانی هاوسەرێتی پێکدێنێت.

١٩٢٣ لەسەر بانگهێشتی ماکس شیللەر لە ئەنجومەنی کانت لە کولندا وتارێك بە ناوی "دازاینو بوونی بێدار" دەخوێنێتەوە.

١٩٢٧ "بوونو زەمان" بڵاودەکاتەوە.

١٩٢٨ لە زانکۆی ئەلبێرت لۆدڤیگ لە فرایبۆرگ وەکو جێگری (ئەدمۆند هۆسێرل) دەبێت بە مامۆستای فەلسەفە.

١٩٢٩ زنجیرەیەك وتار دەخوێنێتەوە.

١٩٣٣ دەکرێ بە سەرۆکی زانکۆی ئەلبێرت-لۆدڤیگ.

١٩٣٤ دەست لە سەرۆکایەتیی زانکۆ دەکێشێتەوە.

١٩٣٥ "سەرچاوەی کاری هونەری" لە شێوەی وتاردا دەخوێنێتەوە.

١٩٣٦ "هۆڵدەرلین‌و ماهیەتی شیعر"

١٩٤٠ "فێرگوزاریی ئەفلاتون سەبارەت بە حەقیقەت"

١٩٤٥ بێبەشکردنی لە وانەگوتنەوە تا ساڵی ١٩٥١

١٩٥٠ زنجیرە وتاری "شت"، "زمان".

١٩٥١ "بیناکردن، خانووکردن، بیرکردنەوە"

١٩٥٣ "زەردەشتی نیچە کێیە؟".

١٩٥٤ "پرسیار لە تەکنۆلۆجیا"

١٩٥٨ "هیگڵ‌و یۆنانیەکان"، "شیعرو هزر".

١٩٥٩ "ڕێگا بەرەو زمان"، "زەوی‌و ئاسمانی هۆڵدەرلین"

١٩٦٠ "زمان‌و خانوو"

١٩٦٢ یەکەمین سەفەر بۆ یۆنان

١٩٦٨ "هۆڵدەرلینی شاعیر"، "هیگل: جیاوازیی سیستمەکانی فیشتەو شیلینگ"

١٩٦٩ کانت: دەربارەی تاقە بەڵگەی شیاو سەبارەت بە بوونی خوا

١٩٧٦ مەرگی هایدیگەر لە ٢٦ی مانگی مەیدا.

# گفتوگۆیەك لەگەڵ هایدیگەردا

**- تەنیا (خوا)یەك ئێمە ڕزگار دەكات -**

**چاوپێكەوتنی مارتن هایدیگەر لە گۆڤاری (دێرشپیگل)ی ئەڵمانی لە ٢٣ی ئەیلولی ١٩٦٦ سازكرا.**

**ئەم چاوپێكەوتنە بە ئینگلیزی لە پەرتووكی:**
**(Marten Heidegger. Philosophical and political writings Munfred stassen (e.d), London: Continuum, 2003) بڵاوكراوەتەوە.**

**دێرشپیگل: پرۆفیسۆر هایدیگەر، چەند جارێك باسكراوە، كە ڕووداوەكانی ژیانت، هەرچەندە كورت نەفەس بوون، بەرهەمە فەلسەفیەكانی ئێوەی داپۆشیوەو بە تەواویش ڕوون نەكراونەتەوە.**

**هایدیگەر: مەبەستت ساڵی ١٩٣٣یە.**

**دێرشپیگل: بەڵێ. پێش ئەو ساڵەو دوای ئەوویش. حەزدەكەم كێشەكە فراوانتر باسبكەین، لەوێوە چەند**

پرسیارێکی گرنگی فەلسەفیانەت، وەکو کاریگەرێتی فەلسەفە بە داکەوتەوە، بە تایبەتی داکەوتی سیاسیت، ئاڕاستە بکەم.

هایدیگەر: ئەم پرسیارانە گرنگن. کێ لەو باوەڕەدایە، کە من دەتوانم وەڵامیان بدەمەوە؟ با ئەو خاڵەش ڕوون بکەمەوە، من پێش بوونم بە سەرۆکی زانکۆ چالاکی سیاسیم نەبوو. لە زستانی ۱۹۳۲-۱۹۳۳ دەوامی زانکۆشم نەکردو لە ماڵەوە دانیشتم.

دێرشپیگل: چۆن بوویت بە سەرۆکی زانکۆی فرایبۆرگ؟

هایدیگەر: لە دێسێمبەری ۱۹۳۲، ڤۆن مۆڵندرۆف Von Mollendorf، پرۆفیسۆری ئەنەتۆمی بە سەرۆکی زانکۆ دانرا. سەرۆکی نوێ دەبوایە لە پانزەی مانگی چواردا دەستی بە دەوام بکردایە. لە زستانی ئەو ساڵەدا منو ئەو لە بارەی بارووددۆخی ڕامیاری زانکۆکانو بە تایبەتی هەڵوێستی خوێندکاران کە ئێمەی نائومێد کردبوو، دواین. بۆچوونی من وابوو، کە ئێمە لە ڕێگەی دەستەڵاتەوە هەوڵبدەین بارووددۆخەکە بەرەو پێشەوە بەرین.





دێرشپیگل: تۆ پەیوەندی نێوان زانكۆكانو بارودۆخی سیاسیت لە ئەڵمانیا بە گشتی دەبینی؟

هایدیگەر: بێگومان، من ئاگاداری ڕووداوە سیاسیەكانی نێوان مانگی یەكو سێی ساڵی ١٩٣٣ بووم. هەندێك جار لەگەڵ مامۆستا لاوەكاندا لە سەریان دەدواین. بەڵام من خۆم لەگەڵ لێكدانەوەی فەلسەفەی پێش سوكراتدا ماندوو دەكرد. لە سەرەتای وەرزی خوێندنی هاویندا بۆ فرایبۆرگ گەڕامەوە. لە ١٦ی مانگی چواردا پرۆفیسۆر ڤۆن مۆڵندورف، سەرۆكی نوێی زانكۆ دەستی بە دەوام كرد. پاش دوو هەفتە بە فەرمانی وەزیری ڕۆشنبیری ناوچەی بادیش دەركرا. تاوانەكەشی ئەوە بوو كە گوایە ناوی مامۆستا (جو)ەكانی بۆ وەزارەت نەناردووە.

دێرشپیگل: پرۆفیسۆر ڤۆن مۆڵندروف سۆشیال دیموكرات بوو. ئایا پاش دەركردنی لە سەرۆكایەتی چی كرد؟

هایدیگەر: ئەو ڕۆژەی دەركرا بۆ لای من هات، گوتی (هایدیگەر دەبێ تۆ ببیت بە سەرۆكی زانكۆ) منیش گوتم، كە لە بەڕێوەبردنی زانكۆدا بێ





ئەزموونم. جێگری سەرۆکی زانکۆش پرۆفیسۆر ساوەر Professor Sauer (مامۆستای تیۆلۆجی) داوای کرد من خۆم بۆ سەرۆکایەتی هەڵبژێرم. مامۆستا لاوەکانیش، کە چەند ساڵێك بوو سەبارەت بە بونیادی زانکۆ لەگەڵیاندا دەدوام، زۆریان لێکردم خۆم هەڵبژێرم. لە ئەنجامدا، بۆ بەرژەوەندی زانکۆ خۆم هەڵبژارد بە مەرجێك هەموو مامۆستاکان دەنگم بۆ بدەن. بەڵام گومانم لە توانایی خۆم بۆ هەڵسوڕانی ئەو کارە بەردەوام بوو. ڕۆژی هەڵبژاردنەکە چوومە ژووری سەرۆکی زانکۆو بە ڤۆن مۆڵندۆرف (سەرۆکی لابراو) و پرۆفیسۆر ساوەرم ڕاگەیاند، کە من ناتوانم خۆم هەڵبژێرم. هەردووکیان گوتیان هەڵبژاردنەکە ئامادەکراوەو ناتوانیت پاشگەز بیتەوە.

دێرشپیگل: پاش ئەمە تۆ ئامادەیی خۆتت دەربڕی. پەیوەندیت لەگەڵ ناسیۆنال سۆشیالستدا چۆن بەست؟

هایدیگەر: ڕۆژی دووەم، چوومە زانکۆ، سەرۆکی خوێندکاران‌و دووانی دیکە هاتنە ژوورەکەم‌و داوایان لێکردم مامۆستا جوەکان لە زانکۆ دەربکەم. من





داواکارییەکەیانم ڕەتدایەوە. لە ژوورەکەم چوونە دەرێو گوتیان بڕیارەکەت بە ڕاپۆرتێك بۆ سەرکردایەتی خوێندکاران دەنێرین. پاش چەند ڕۆژێك لە فەرمانگەی خوێندنی باڵاوە دکتۆر (باومان) تەلەفۆنی بۆ کردمو گوتی کە هەموو زانکۆکان بەو کارە هەستاونومنیش پێویستە لە فەرمانیان دەرنەچمو ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکە بکەم ئەوا دەبێت واز لە سەرۆکایەتی زانکۆ بهێنم یان وەزیری ڕۆشنبیری ڕازی بکەم. وەزیری ڕۆشنبیریش ڕازی نەبوو[١].

دێرشپیگل: تاکو ئەم کاتە ئەوە نەزانراوە.

هایدیگەر: هاندەری بڕیاردانەکەم بۆ خۆهەڵبژاردن بۆ سەرۆکایەتی زانکۆ لە گوتارەکەمدا لە ساڵی ١٩٢٩ لە فرایبۆرگ بە ناوی (میتافیزیك چیە؟) ڕوونکراوەتەوە، (بواری زانستەکان لە یەکدی داپچڕاونو میتۆدی مامەڵەکردنیان لەگەڵ بابەتەکاندا جیاوازن. ئەمڕۆ ئەم فرە بوارە جیاوازانە لە تەکنیکی ڕێکخستنی زانکۆکاندا پێکەوە گرێدراونو بوون بە یەکەیەكو واتاکانیان لە بەشە ئەکادیمیەکاندا پرگماتیکیانە لێکدەدرێنەوە[٢].

ڕەگوڕیشەی زانستەکان لەناو زەمینەکەیاندا هەڵکێشراون). ئەوەی من دەمویست بۆ زانکۆی بکەم (کە ئەمڕۆ بەرەو ڕووخان چووە) لەو کۆڕەمدا لە هەڵبژاردنەکەمدا دەرکەوتووە[٣].

دێرشپیگل: دەمانەوێ بزانین ئەم بۆچوونەی ساڵی ١٩٢٩ لەگەڵ بۆچوونی گوتارەکەی ساڵی ١٩٣٣دا کۆکن یان نا؟ ئێمە ڕستەیەك لەو گوتارە هەڵدەکێشین (سەربەستی ئەکادیمی لە زانکۆکانی ئەڵمانیادا درۆ و نەرێیە). لەوانەیە ئەم ڕستەیە بیرۆکەیەك بێت ئەمڕۆش لەلای تۆ دوور نەبێت.

هایدیگەر: بەڵێ، ئەمڕۆش باوەڕم بەو ڕستەیەیە. چونکە سەربەستی ئەکادیمی گەلێك جار نەرێیە. ئەم سەربەستیە خۆ دوورخستنەوەیە لە باسکردنو بیرکردنەوە لەو گرفتانەی توێژینەوە زانستیەکان هەیانە. بەڵام ئەم ڕستەیەی تۆ هەڵبژاردووەو لە گوتارەکە دەرتهێناوە نابێت لە دەقەکەی جیابکەینەوە. پێویستە لەنێو بەستێنی گوتارەکەوە لە واتاکەی بکۆڵرێتەوەو لەوێدا واتای سەربەستی نەرێ دەردەکەوێت.





**دێرشپیگل:** باشە. لە گوتاری بوون بە سەرۆکی زانکۆ بە جۆرێکی نوێتر باستکردووە. چوار مانگ پاش دامەزراندنی هیتلەر بە سەرۆکی ڕایخ دەڵێیت (گەورەیی‌و مەزنی ئەم بەرەبەیانە نوێیە).

**هایدیگەر:** بەڵێ، باوەڕم وابوو.

**دێرشپیگل:** ئایا دەتوانیت زیاتر ڕوونی بکەیتەوە؟

**هایدیگەر:** بە خۆشیەوە. لەوکاتەدا من بەدیلی سیاسیم نەدەبینی. لەنێو سەرلێشێواوی بیروباوەڕەکانداو ٢٢ پارتی سیاسی، پێویست بوو بیروباوەڕێکی ناسیۆنالیستانەو لەسەرو ئەمەشەوە سۆشیالیستانە بدۆزرێتەوە.

وەکو هەوڵدانەکەی (فردریك ناومن Fridrick Naumann) بۆ نموونە، نوسراوەکەی (ئێدوار سپرەنگەر Edward Spranger) زیاتر لە گوتارەکەی من مامەڵە لەگەڵ کێشەکەدا دەکات.

**دێرشپیگل:** کەی نیازی دیاریکردنی هەڵوێستی سیاسیت هەبوو. بیست‌و دوو پارتی سیاسی لەوەوپێش هەبوون‌و لە ساڵی ١٩٣٠ ملیۆنەها بێکار هەبوو.





هایدیگەر: لەو کاتەدا من لەگەڵ پرسیارەکانی نێو (بوون‌و کات)دا ١٩٢٧ وە وانەگوتنەوەکاندا خەریکبووم. ئەمانە پرسیاری بنەڕەتی بیرکردنەوەن‌و ناڕاستەوخۆ کاردەکەنە سەر کێشە کۆمەڵایەتی‌و نەتەوەییەکان، بەڵام من وەکو مامۆستایەك ئەو پرسیارەی لەگەڵما دەژیا لە بارەی واتای زانست‌و ڕۆڵی زانکۆکان بوو. ئەمەش لە گوتارەکەمدا (سەربەخۆیی زانکۆکانی ئەڵمانییا) باسکراوە. ئەوانەی دژی گوتارەکەم دەدوێن ئەمەیان خوێندۆتەوەو بە گوێرەی بارودۆخی ئەو کاتە واتەکەیان لێکداوەتەوە.

دێرشپیگل: بەڵام دوو نوسراو لەسەر سەربەخۆیی زانکۆکانی ئەڵمان لەو کاتە شێواوو ئاڵۆزەدا کەمێك ناجۆر نەبوو؟

هایدیگەر: بۆچی ناجۆرە؟ سەربەخۆیی زانکۆکان بەرانبەر سیاسەت‌و داواکانی پارتی ناسیۆناڵ سۆشیالیست‌و ڕێکخراوی خوێندکاراندا ناکۆك‌و دژوەستاو بوو. لەو کاتەدا سەردێڕی گوتارەکە واتایەکی جیاوازی هەبوو، سیاسەتی بە واتای ئەمڕۆ لێکنەدەدایەوە. مەبەستی گوتارەکە لە زانستی

سیاسەت، وەکو زانستو دامەزراندنی بەهاکانی بوو بە گوێرەی پێویستیە کۆمەڵایەتیەکان بە پێچەوانەی ئەمەشەوە لە گوتارەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە.

دێرشپیگل: ئایا ئێمە بە تەواوی لە تۆ تێدەگەین؟ تۆ زانکۆ بەلای لایەنێکدا دەبەیت، کە ناوی دەنێیت بەرەبەیانی نوێ. هاوکات دەتەوێ زانکۆ دژی ئەو ڕووداوانە ڕاوەستێت، کە لە ژوور دەستەڵاتی زانکۆوەنو ناسنامەکەی دەشێوێنن.

هایدیگەر: بێگومان، ڕۆڵی سەربەخۆیی لەوێدا دەردەکەوێت، کە ڕواڵەتی زانکۆ بۆ بونیادە تەکنیکیەکەی بگەڕێنیتەوەو بتوانێت واتایەکی نوێ لەنێو نەریتی بیرکردنەوەی ڕۆژئاواو ئەوروپادا پەیدابکات.

دێرشپیگل: پرۆفیسۆر، ئایا دەتەوێ بڵێیت، کە زانکۆ بە پەیوەندی بەستن لەگەڵ ناسیۆنال سۆشیالیستدا خۆی دەپارێزێ؟

هایدیگەر: نەخێر. ئەوە نادروستە. من باسی پەیوەندی لەگەڵ ناسیۆنال سۆشیالیستدا ناکەم. پێویستە زانکۆ بە ڕێگەی بیرکردنەوە خۆی نوێ بکاتەوەو دژی بە سیاسیکردنی زانکۆ بوەستێت.

دێرشپیگل: لەبەرئەمەیە تۆ لە گوتارەکەتدا سێ کۆڵەکە بە گرنگ دادەنێیت: ڕاژە گوزاری کارکردن، ڕاژەگوزاری لەشکرو ڕاژەگوزاری زانین. لێرەدا دەتەوێ بڵێیت، کە ڕاژەگوزاری زانین لەگەڵ دووانەکەی دیکە هاوتەرازن لە هەڵسوڕانی ئەمەدا ناسیۆنال سۆشیالیست دەبێت بەڕێگر.

هایدیگەر: من لە کۆڵەکە نادوێم. ئەگەر بە وردی گوتارەکە بخوێنیتەوە دەبینیت ڕاژەگوزاری زانین دوای دوانەکەی دیکە ڕیزکراوە. بەڵام لە ڕووی واتابەخشین دەکەوێتە پێش ئەوانەوە. پێویستە ئەوە بزانین کە کارکردنو لەشکر لەسەر زەمینەی زانین ڕادەوەستنو زانین ڕۆشناییان دەخاتە سەر.

دێرشپیگل: با بگەڕێینەوە سەر ئەو ڕستەیەی ناتوانین ئەمڕۆ بینوسینەوە. تۆ لە ساڵی ١٩٣٣دا نووسیوتە (با ڕێبازو بیروباوەڕەکان حوکم بەسەرتا نەکەن. سەرۆك بە تەنیا ئێستاو داهاتووی ئەڵمانیایە).

هایدیگەر: ئەم ڕستەیە لەناو گوتارەکەمدا نەبوو. کە لە گۆڤاری خوێندکارانی فرایبۆرگ لە ١٩٣٣-١٩٣٤دا بڵاوکرایەوە خرایە سەری. کاتێك بووم بە سەرۆکی





زانکۆ تێگەیشتم بەبێ سازشکردن ناتوانم کارەکانم بەڕێوەبەرم. ئەمڕۆ ڕستەی وا نانوسمو تەنانەت ساڵێکیش دوای ئەوە لە ١٩٣٤دا نەمدەتوانی بینووسم.

دێرشپیگل: دەتوانم پرسیارێکی دیکەی لەم جۆرەت لێبکەم؟ ئێستا ئاشکرایە هەڵوێستی تۆ لە ساڵی ١٩٣٣ لە نێوان دوو ڕێگای جیاوازدا بوو. لە لایەکەوە دەتوانیت زۆر شت بۆ خەڵکی ڕوون بکەینەوە، ئەمە ڕێگایەکە بەڵام ڕێگاکەی دیکە پۆزەتیف نیە بە تایبەتی لەوێدا کە دەڵێیت (هەستم دەکرد شتێکی نوێ لە ئارادایە، بەرەبەیانێکی نوێ).

هایدیگەر: دروستە، من ئەوەم دەبینی.

دێرشپیگل: ئایا دەزانیت پەیوەندی تۆ لەگەڵ ناسیۆناڵ سۆشیالیستدا جۆرە شەرمەزارییەکەو تاکو ئەمڕۆ لە لایەن تۆوە ڕەتنەکراوەتەوە. تۆ تاوانبارکراوی بەوەی بەشداری سوتاندنی پەرتووکت لە لایەن خوێندکارانو لاوانی هیتلەرەوە کردووە(٤).

هایدیگەر: من ڕێگام بە خوێندکاران نەدا لە زانکۆدا پەرتووك بسوتێنن.

دێرشپیگل: تاوانبارکراوی بەوەی پەرتووکی نووسەرە جوەکانت لە سێمیناری فەلسەفە لابردووە.

هایدیگەر: من بەڕێوەبەری سێمینار بووم‌و سەرپەرشتی پەرتووکخانەکەشم دەکرد. هەرگیز پەیڕەوی فەرمانی لابردنی پەرتووکی نووسەرە جوەکانم نەکردووە. ئەوانەی لەگەڵما لە سێمینار بوون گەواهن، کە پەرتووکی جوەکان لانەبراون. ئەو نووسەرە جوانە، لەسەرو هەموویانەوە هوسرڵ تاکو ١٩٣٣ پەرتوکەکانیان خوێندراونەتەوەو ئاماژە بۆ بیروباوەڕەکانیان کراوە.

دێرشپیگل: سەرچاوەی تاوانبارکردنی تۆ چیە؟ ئایا تەنیا دژایەتیە؟

هایدیگەر: باوەڕم بە سەرچاوەکە نیە. بەڵام بۆ ناوزڕاندنی منە. هەڵبژاردنم بە سەرۆکی زانکۆ ڕووداو بوو نەك شتێکی حەتمی. هەڵبەتە تاوانبارکردنی من‌و پەلاماردانم وابەستە بەو ڕووداوەوە.

دێرشپیگل: تۆ دوای (١٩٣٣) خوێندکاری (جو)ت هەیە. ئایا پەیوەندیت لەگەڵیاندا چۆن بوو؟

هایدیگەر: هەڵوێستم دوای ١٩٣٣ نەگۆڕا. یەکێك لە خوێندکارە کۆن‌و زیرەکەکانم هێلینە وایز (Helene Weiss) بوو، کە چوو بۆ سکۆتلاندو





نەیتوانی لە فرایبۆرگ لەسەر خوێندن بەردەوام بێت، دکتۆراکەی لە (باسیل) تەواوکرد. ئەم خوێندکارە کچە لە پێشەکی نامیلکەی دکتۆراکەیدا نوسیویەتی، (تەفسیری فینۆمینۆلۆجیانە، کە لێرەدا پەیڕەویم کردووە دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری لێکۆڵینەوە بڵاونەکراوەکانی مارتن هایدیگەر لەمەڕ فەلسەفەی یۆنانی لە بیروباوەڕی مندا). من دانەیەك لە نامیلکەکەم لایە کە لە چاپدراوەو نووسیو بە دیاری بۆی ناردوومو بە خەتی خۆی پێشکەشی منی کردووە. من چەند جارێکیش لە (بروکسل) پێش مردنی میوانی دکتۆر (وایز) بووم.

دێرشپیگل: تۆو (یاسپرز) بۆ ماوەیەکی درێژ هاوڕێ بوون. لە ساڵی ١٩٣٣ هاوڕێیەتیتان ساردی تێکەوت. گوایە ژنەکەی یاسپرز (جو بوو) هۆی تێکدانی هاوڕێیەتیەکەتان بوە. تۆ سەبارەت بەمە چی دەڵێیت؟

هایدیگەر: منو (یاسپرز) لە ساڵی ١٩١٩ەو هاوڕێین. لە ساڵی ١٩٣٣ چووم بۆ (هایدڵبرگ) بۆ سەردانی (یاسپرز) و ژنەکەی. لە نێوان ١٩٣٤ تا ١٩٣٨





(کارڵ یاسپرز) هەموو بەرهەمە بڵاوکراوەکانی بە سڵاوەوە بەدیاری بۆ دەناردم.

دێرشپیگل: تۆ خوێندکاری (ئەدمۆند هوسرڵ) بوویت. ئەو مامۆستا (جو)ەی لە پێش تۆدا لە فرایبۆرگ مامۆستای فەلسەفە بوو. داوای لە زانکۆ کرد تۆ لە جێگاکەی ئەو دابمەزرێنن. پەیوەندیت لەگەڵیا پێویستی بە سوپاسکردنو ڕێزلێنانە.

هایدیگەر: دڵنیام لەوە. پەرتووکی (بوونو کات)م پێشکەش بەو کردووە.

دێرشپیگل: بێگومان. بەڵام پەیوەندییەکەتان لە دواییدا شێوا. ئایا دەتوانیت هۆکەی ڕوون بکەیتەوە؟

هایدیگەر: جیاوازی نێوانمان لەسەر کێشە فەلسەفیەکان سەری هەڵدا. لە سەرەتای ساڵەکانی سییەوە (هوسرڵ) بە ئاشکرا خۆی لە منو (ماکس شیلەر) دووردەخستەوە. من نەمدەزانی بۆچی (هوسرڵ) لەگەڵ بۆچوونە فەلسەفیەکانی مندا ناکۆك بوو و خۆی لە من دووربخاتەوە.

دێرشپیگل: لە کوێ ئەمە ڕوویدا؟

هایدیگەر: (هوسرڵ) لە کۆڕەکەیدا لە هۆڵی وەرزشی بەرلین باسی ئەمەی کرد. هەروەها (ئیرك





میوهسام) لە یەکێك لە ڕۆژنامەکانی بەرلین ئەم هەواڵەی بڵاوکردەوە.

دێرشپیگل: کێشەی ناکۆکیەکەتان لە بەستێنی فەلسەفیەوە بۆ ئێمە گرنگ نیە. ئەوەی دەمانەوێ بیزانین ئەوەیە کە هیچ ناکۆکیەکتان پەیوەندی بە ڕووداوی ساڵی ١٩٣٣ەوە نەبووە.

هایدیگەر: بەڵێ، وایە.

دێرشپیگل: گوایە لە ساڵی ١٩٤١، کە بۆ جاری دووەم (بوونو کات) لە چاپ درا. پێشکەشکردنی پەرتووکەکەت بۆ (هوسرڵ)، کە لە یەکەم چاپدا نووسرابوو لاتبرد.

هایدیگەر: وایە. باسی ئەم خاڵەم لە پەرتووکەکەمدا (On the way to Language) کردووەو لەوێدا نووسیومە، (ئەم کێشەیە منی تاوانبار کردووە. پێشکەشکردنی (بوونو کات)، کە لە لاپەڕە (١٦)دا نووسراوە تاکو چوارەمین جار لە چاپ درایەوە وەکو خۆی مایەوە. لە ساڵی ١٩٤١ بۆ پێنجەم جار لە چاپ درایەوە، دەستگای بڵاوکردنەوەکە لەوە دەترسا، کە لەبەر پێشکەشکردنەکە ڕێگای لە چاپدانی پێنەدرێت. منیش لەگەڵیا هاوڕا بووم. لەسەر

پێشنیاری (نیمایەر Niwmeyer) پێشکەشکردنەکەمان لابرد. بەڵام داوام کرد، کە تێبینی لاپەڕە ٣٨ (چاپی ئەڵمانی) لانەبرێتو لە چاپ بدرێت، کە دەڵێت (ئەگەر ئەم توێژینەوەیە توانیبێتی بۆ دەرخستنو ڕوونکردنەوەی (هەبووەکان لەنێو خۆیاندا) هەنگاوی بەرەو پێشەوە نابێت، دەبێت نووسەر سوپاسی (ئەدمۆند هوسرڵ) بکات. ڕێنیشاندانو پێشنیارەکانیو ڕێگەدانی بە خوێندنەوەی بەرهەمە بڵاونەکراوەکانی گەلێك لایەنی توێژینەوەی فینۆمینۆلۆجیانەی لەو ساڵانەدا لە (فرایبۆرگ) خوێندکار بووم بۆ ڕوونکردمەوە).

دێرشپیگل: کەوابوو پێویست ناکات بپرسین، کە تۆ وەکو سەرۆکی زانکۆی[٥] (فرایبۆرگ) ڕێگەی هوسرڵت نەگرت پەرتووکەکانی پەرتووکخانەی زانکۆو سیمیناری فەلسەفە بەکاربهێنێت.

هایدیگەر: ئەمە بوختانە.

دێرشپیگل: تۆ هیچ نامەیەکت لەم بارەیەوە نەنووسیوە؟ چۆن ئەم بوختانەت بۆ هەڵبەسترا؟

هایدیگەر: من نازانم چۆنو وەڵامم بۆ ئەم پرسیارە نیە. من دەتوانم بیسەلمێنم. کە ئەمە

بوختانە. کاتێك بووم بە سەرۆکی زانکۆ توانیم دوو مامۆستای (جو)، پرۆفیسۆر (تانهاوسەر) سەرۆکی کۆلیجی پزیشکیو پرۆفیسۆر (ڤۆن هێڤیس)، کە لە دواییدا خەڵاتی نۆبڵی لە فیزیا وەرگرت، لەسەر کارەکانیان بهێڵمەوە. وەزارەت داوای دەرکردنیانی کرد، بەڵام من داواکارییەکەی وەزارەتم ڕەت دایەوە. ئەمەش ئەوە دەردەخات، کە ناماقوڵانەیە من ئەم دوو مامۆستایە لە شوێنی خۆیان دانێمو لەگەڵ هوسرڵدا کە مامۆستای منە بە ناشرینی مامەڵەی لەگەڵدا بکەم. تەنانەت ڕێگەم بە مامۆستاو خوێندکارەکان نەدا دژی پرۆفیسۆر (تانهاوسەر) خۆپیشاندانیان هەبێت. لەو کاتەدا مامۆستا هەبوون بەبێ مووچە وانەیان دەگوتەوەو بۆ موچە ئەم هەلەیان دەقۆزییەوە. کاتێك هاتن بۆ لامو داوای دەرکردنی ئەو مامۆستایەیان کرد من ڕەتم دانەوە.

دێرشپیگل: لە ساڵی ١٩٣٨ ئامادەی پرسەکەی (هوسرڵ) نەبووبێت.

هایدیگەر: ڕێگەم بدە لەو بارەیەوە شتێکت بۆ ڕوون بکەمەوە. ئەوە ڕاست نیە کە من پەیوەندیم لەگەڵ (هوسرڵ) بڕی. لە مانگی چواری ١٩٣٣





هاوسەرەکەم بە ناوی هەردووکمانەوە نامەیەکی دۆستانەی بۆ هاوسەرەکەی (هوسرڵ) نووسیو لەگەڵ چەپکێ گوڵدا بۆ (هوسرڵ)مان نارد. هاوسەرەکەی (هوسرڵ) بە ڕەقییەوە وەڵامی داینەوەو نووسیبووی کە هاوڕێیەتی ئەوانو ئێمە کۆتایی پێهاتووە.

من خۆم لەو بارەیەوە بە کەمتەرخەم دادەنێم، کە لە کاتی نەخۆشیەکەیدا یان مردنیدا ڕێزو هەستی خۆمم بۆ دەرنەبڕی. دوایی بە نامە داوای لێبوردنم لە هاوسەرەکەی کرد.

دێرشپیگل: (هوسرڵ) لە ساڵی ١٩٣٨دا مرد. تۆ لە مانگی دووی ١٩٣٤ وازت لە سەرۆکایەتی زانکۆ هێنا. ئایا هۆی ئەو وازلێهێنانەت چی بوو؟

هایدیگەر: دەمەوێ ئەو خاڵە ڕوون کەمەوە، کە دەمویست گۆڕانکاری لە تەکنیکی ڕێکخستنی زانکۆدا بکەم. ئەمەش چاکسازیکردنی کۆلیجەکان بوو لە ناوەوە بە گوێرەی ئەو ئامانجەی لە زانکۆکان چاوەڕوان دەکرا. بۆ ئەم مەبەستە لە زستانی ١٩٣٣-١٩٣٤ چەند مامۆستایەکی لاوم بۆ شوێنی ڕاگری کۆلیجەکان هەڵبژارد، کە لێهاتوو بوون بەبێ ئەوە بڕوانمە بیروباوەڕە سیاسیەکانیان. ئەم ڕاگرانەش





دانران، پرۆفیسۆر (ئێرك ولف) بۆ كۆلیجی یاساو پرۆفیسۆر (شادەوەڵت) بۆ فەلسەفەو پرۆفیسۆر (سۆیەرگڵ) بۆ زانستە سروشتیەكانو پرۆفیسۆر (ڤۆن هۆڵندۆرف) بۆ پزیشكی كە لە پێش مندا سەرۆكی زانكۆ بوو. لە كۆتایی ساڵی ١٩٣٣دا ئەو ڕاستیەم بۆ دەركەوت، كە پرۆژەی چاكسازییەكەم لە لایەن پارتی دەستەڵاتمەدارەوە ڕەت دراوەتەوە. وەزیر داوای كردمو منیش چووم بۆ (كارلس ڕوە) بۆ لای. لە ژوورەكەیدا جێگری وەزیرو سەرۆكی یەكێتی خوێندكارانی نازییەكان دانیشتبوون. داوایان لێكردم ڕاگری كۆلیجی یاساو پزیشكی لابەرمو لە جێگەیان ئەو مامۆستایانە دانێم، كە سەر بە پارتی دەستەڵاتمەدارن. من داواكارییەكەیانم ڕەت دایەوەو وازم لە سەرۆكایەتی زانكۆش هێنا. ئەمە لە مانگی دووی ١٩٣٤دا ڕووی دا. دوای ئەوەی بۆ دە مانگ سەرۆكی زانكۆ بووم وازم هێنا، كە ئەبوایە سەرۆكی زانكۆ بە لای كەمەوە بۆ دوو ساڵ خزمەت بكات. هەموو ڕۆژنامەكان هەواڵی دامەزراندنو لابردنی سەرۆكی زانكۆكانیان بڵاودەكردەوە بەڵام هیچ ڕۆژنامەیەك لەسەر وازلێهێنانەكەی منی نەنووسی.





دێرشپیگل: ئایا توانیت لە دەرفەتێکدا پرۆژەی چاکسازییەکەت بخەیتە بەردەم وەزیری ڕایخ؟

هایدیگەر: لەچی دەرفەتێکدا؟

دێرشپیگل: لەو دەرفەتەدا (ڕەست) Rust (وەزیری ڕایخ) لە مانگی دووی ساڵی ١٩٣٣ سەردانی فرایبۆرگی کرد.

هایدیگەر: ئێمە لێرەدا باسی دوو کێشە دەکەین. من لەو بەرنامەیەدا کە بۆ (شەخگێتەرو شۆنوا) گیرا بە ڕەسمی بەخێرهاتنی وەزیرم کرد. بۆ دووەم جار لە مانگی یانزەی ١٩٣٣ لە بەرلین وەزیرم بینیو بیروڕای خۆمم سەبارەت زانستو بونیادی کۆلیجەکان بۆ ڕوون کردەوە. ئەو گوێی لێگرتمو منیش ئومێدەوار بووم بیروڕاکەم کاریگەر بێت. بەڵام هیچ ڕووی نەدا. ئەم چاوپێکەوتنەی من لەگەڵ وەزیری پەروەردەدا بووە هۆی لۆمەکردنم لە کاتێکا تەنانەت دەوڵەتە بێگانەکانیش سازشیان بۆ هیتلەر دەکردو (ئیعترافیان) پێکرد[٦].

دێرشپیگل: دوای وازهێنانت لە سەرۆکایەتی زانکۆ ئایا پەیوەندیت لەگەڵ پارتی نازییدا گۆڕا؟

هایدیگەر: دوای وازهێنان لە سەرۆکایەتی زانکۆ خۆم بە وانەگوتنەوە ماندوو کرد.

لە هاوینی ١٩٣٤ وانەم لەسەر لۆجیك دەگوتەوەو دواییش لەسەر (هۆڵدەرلن). لە ساڵی ١٩٣٦ وانەکانم لەسەر (نیتشە) دەستیان پێکرد. هەموو ئەوانەی دەهاتنە وانەکانم‌و گوێیان لە دەنگم بوو دەزانن من دژی نازی دەدوام.

دێرشپیگل: سەرۆکی نوێی زانکۆ چۆن دانرا؟ ئایا تۆ بەشداری ئاهەنگەکەت کرد؟

هایدیگەر: من نەڕۆیشتم.

دێرشپیگل: ئایا سەرۆکی نوێ ئەندامێکی پارتی بوو؟

هایدیگەر: مامۆستای کۆلیجی یاسا بوو. ڕۆژنامەی Der Alemanne، کە ئۆرگانی پارتی بوو هەواڵەکەی بڵاوکردەوەو بە گەورەیی لەسەر دێڕی هەواڵەکەدا نوسرابوو، کە بۆ یەکەم جار نازییەك دەبێت بە سەرۆکی زانکۆ.

دێرشپیگل: هەڵوێستی پارتی نازی بەرانبەر تۆ چۆن بوو؟

هایدیگەر: خرامە ژێر چاودێرییەوە.





دێرشپیگل: تۆ دەتزانی، کە لەژێر چاودێریدایت؟

هایدیگەر: بەڵێ.

دێرشپیگل: چۆن؟

هایدیگەر: دکتۆر (هانکە) هات بۆ لام. ئەو دکتۆراکەی لە زستانی ١٩٣٦-١٩٣٧دا تەواو کردو لە ساڵی ١٩٣٧ بەشداری سێمینارەکانی منی دەکرد. دکتۆر (هانکە) لە لایەن دەستگای ئاسایشەوە دانرابوو من بخاتە ژێر چاودێرییەوە[٧].

دێرشپیگل: بۆچی ئاگاداری کردیت؟

هایدیگەر: لەبەر وانەکانم لە ساڵی ١٩٣٧ لەسەر نیتشە. گوتی ناتوانێت لەوە زیاتر من بخاتە ژێر چاودێرییەوەو داوای لێکردم ئاگام لە خۆم بێت.

دێرشپیگل: کەواتە پارتی نازی تۆی لەژێر چاودێریدا دانابوو؟

هایدیگەر: دوایی زانیم، کە ڕێگەشیان نەدەدا خوێندکاران ئاماژە بۆ نووسراوەکانم بکەن، بە تایبەتی بڵاوکراوەکانم لەسەر بیردۆزی ڕاستی لای (ئەفلاتون)و وانەکانم لەسەر (هۆڵدرلین) شاعیرێکە لە ساڵی ١٩٣٦ لە خوێندنگای (جێرمەنیك) لە (ڕۆما) پێشکەشم کردن. هەروەها گۆڤاری ( Wille und





Macht) لە لایەن یەکێتی لاوانی هیتلەرەوە بڵاودەکرایەوە هێرشم کرایە سەر. ئەوانەی دەیانەوێت زیاتر لەم بارەیەوە بزانن دەتوانن ئەو ڕەخنانەش بخوێننەوە، کە لە گۆڤاری ( Volk im Werden) لە ساڵی ١٩٣٤ لە من گیران. لە ساڵی ١٩٣٧ ناوی منیان لە لیستی بەشداربووانی کۆنگرەی دێکارت لە پاریس دەرهێنا. پرۆفیسۆر (برۆهیەر) سەرۆکی کۆنگرەکە لە زانکۆی (سۆربۆن) سەری سوڕمابوو لەوەی ناوی من لەناو لیستی بەشداربووواندا نەبوو. خۆی پەیوەندی پێوەکردم هۆکەی بۆ ڕوون بکەمەوە. من داوام لێکرد کە بۆ زانینی هۆکەی پەیوەندی بە وەزارەتەوە بکات. پاش پەیوەندیکردنی ئەو نامەیەکم لە وەزارەتەوە بۆ هاتو داوایان کرد بچم بۆ پاریس، بەڵام من نەچووم پەرتووکەکانم لەسەر (میتافیزیك چیە؟) و (لەسەر ناوەڕۆکی ڕاستی) لە (پاریس) بە دزییەوە دەفرۆشران. هەروەها لە ساڵی ١٩٣٤ ئەو گوتارەی لە ئاهەنگی بوون بە سەرۆکی زانکۆ خوێندمەوە لەناو ئەدەبیاتی پارتیدا دەرهێنرا.

دێرشپیگل: ئایا دوای ئەوە ڕووداوەکان زیاتر ڕوویان لە خراپی کرد؟

هایدیگەر: کە جەنگ دەستی پێکرد (٥٠٠) زانا و ڕۆشنبیرو هونەرمەند لە خزمەتی سەربازی لێبوران. من لە ناویاندا نەبووم. بە پێچەوانەوە لە هاوینی ١٩٤٤ من بۆ چاڵ هەڵکەندن بۆ سەر (ڕینە) Rhine برام.

دێرشپیگل: (کارڵ بارت)یش بۆ چاڵهەڵکەندن بۆ سنووری سویسرا برا.

هایدیگەر: ئەمە سەیر ڕوویدا. سەرۆکی زانکۆ داوای کۆبوونەوەی مامۆستایانی کرد. گوتارێکی بۆ خوێندینەوە کە تیایدا جەختی لەسەر ئەو خاڵە دەکرد جیاوازی لە نێوان بۆچوونی پارتیو ئەودا نیەو بڕیارەکانی ئەو بڕیاری پارتین. لەوێدا مامۆستاکانی کرد بە سێ دەستەو تاقمەوە: دەستەی یەکەم ئەو مامۆستایانە بوون، کە دەبوایە وازیان لە کارەکەیان بهێنایە. دووەم، ئەوانەی تاکو ڕادەیەك نەك بە تەواوی دەتوانن مامۆستایەتی بکەنو دەرناکرێن. سێیەم، ئەو مامۆستایانەی لە جێگای خۆیاندا دەمێننەوەو دەرناکرێن. ئەو مامۆستایانە کە





دەبوایە بە تەواوی وازیان لە مامۆستایەتی بهێنایەو دەردەکران (هایدیگەرو ڕیتەر) بوون[٨]. لە زستانی ١٩٤٤-١٩٤٥ پاش گەڕانەوەم لە چاڵهەڵکەندن کۆڕێکم لەسەر (شیعرو نووسینو بیرکردنەوە) بەست. بیری ئەم کۆڕە بەردەوامیەك بوو لە بیری نێو وانەکانم لەسەر (نیتشە) و دژوەستان بوو بەرامبەر پارتی نازی. پاش ئەمە کە بە تەمەنترین مامۆستا دانرام بە زۆر خرامە ناو بەرنامەی (Volkssturm)ەوە[٩].

دێرشپیگل: بە کورتیەکەی تۆ لە ساڵی ١٩٣٣ کەسێکی سیاسی نەبوویتو کەوتیتە نێو سیاسەتی ئەم بەرەبەیانە تازەیەوە..

هایدیگەر: لە ڕێگای زانکۆوە.

دێرشپیگل:.. لە ڕێگای زانکۆوە کەوتیتە نێو سیاسەتی ئەو بەرەبەیانە تازەیەوە. پاش ساڵێکیش وازت لە سەرۆکایەتی زانکۆ هێنا. بەڵام لە وانەکەتا لە ساڵی ١٩٣٥، کە دوایی بە ناوی (پێشەکیەك بۆ میتافیزیك) لە ساڵی ١٩٥٣ بڵاوکرایەوە دەڵێیت (ئەو نوسراوانەی ئەمڕۆ بە ناوی فەلسەفەی ناسیۆنال سوشیالیزمەوە بڵاودەکرێنەوە لە ڕاستی ئەم بزوتنەوەیەوە دوورن (وەکو ناکۆکی نێوان

تەکنەلۆجی جیهانیو مرۆڤی سەردەم)، نووسەرەکانیان ئەو ماسیگرانەن تووشی گرفتی بەهاو هەموو گەرایەتی بوون). ئایا بۆچی کە لە ساڵی ١٩٥٣ بڵاوت کردەوە بۆ خوێنەری ڕوون بکەیتەوە مەبەستت لە ڕاستی بزوتنەوەکە چی بوو؟ ئایا ئەو نووسراوە بەڵگەیە بۆ بیروباوەڕەکانی تۆ لەو ساڵانەدا[١٠]؟

هایدیگەر: لە سەرەتاوە ئەوە بەشێك بوو لە نووسراوەکەمو بۆچوونی من سەبارەت بە واتای تەکنەلۆجیا لەو کاتەدا، نەك بەو شێوەیەی لە دواییدا (وەکو خزانە نێو چوارچێوەوە) تەفسیرم کردووە. من بۆیە ئەو پەرەگرافەم بە دەنگێکی بەرز نەخوێندەوەو دڵنیابووم لەوەی بیسەر لە مەبەستی من تێدەگات. ئەوانەی نەزان بوونو سیخوڕییان بەسەرمەوە دەکرد بە جۆرێکی دیکە لە واتاکەی تێدەگەیشتن[١١].

دێرشپیگل: تۆ بزوتنەوەی کۆمۆنیستانەش بەو شێوەیە دەبینیت؟

هایدیگەر: بەڵێ. چونکە لەژێر دەستەڵاتی تەکنەلۆجیادایە.

دێرشپیگل: هەروەها (ئەمەریکایزم)یش؟

هایدیگەر: بەڵێ، دەمەوێ ئەوەش بڵێم لە ماوەی ئەم سی ساڵەدا دەبوایە بزانرایە کە بزوتنەوەی تەکنەلۆجیای جیهانگەرانە هێزێکە بۆ داگیرکردنی مێژوو و نابێت چاوپۆشی لێبکرێت. ئەو پرسیارەی ئەمرۆ بۆ من گرنگە ئەوەیە، ئایا چ ڕژێمێکی سیاسی پەیوەندی خۆی لەگەڵ تەکنەلۆجیادا هاوتەراز دادەنێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارەم لا نیەو لەو باوەڕەشدام، کە ئەو ڕژێمە ڕژێمی دیموکراتیەت نیە.

دێرشپیگل: چەند چەمکێك لەژێر چەتری (دیموکراسیەت)دا کۆدەبنەوە. بەڵام پرسیارەکەی من سەبارەت بە گۆڕانی ڕژێمەکەیە، ئایا چۆن گۆڕانی بنەڕەتی ئەو ڕژێمە سیاسیە دەرەخسێ؟ تۆ دوای ساڵی ١٩٤٥ لە کاریگەرێتی ڕژێمی سیاسی ڕۆژئاوا، هەروەها دیموکراسیەت دوایت. ئایدیۆلۆجی مەسیحایەتیو دەوڵەتی خاوەن دەستور بە (نیوەی ڕاستی) دادەنێیت.

هایدیگەر: پێش هەموو شتێك حەزدەکەم ڕوونی بکەیتەوە من لە کوێدا باسی دیموکراسیەتو ئەو شتانەم کردووە.. بۆیە بە (نیوەی ڕاستی) دایاندەنێم،

چونکە هیچ کامیان خاوەنی ئەو دەستەڵاتە نیە دژی تەکنەلۆجیا ڕاوەستێتو هاوکات بانگەشەی ئەوەش دەکەن، کە خاوەنی ئەو دەستەڵاتەن. بە بۆچوونی من ئەوە نالەبارە. تەکنەلۆجیا لە ناوەڕۆکدا بووە بە شتێك کە مرۆڤ ناتوانێت دەستەمۆی بکات.

دێرشپیگل: ئەو سێ شتەی ئاماژەت بۆ کردوون، کامیان زیاتر سەردەمییە؟

هایدیگەر: من نازانم. ئەوەی بۆ من گرنگە وەڵامی ئەو پرسیارەیە، ئایا مەبەستت لە (سەردەمی) یان (کات) چیە؟ لەگەڵ وەڵامی ئەم پرسیارەشدا پرسیارێکی دیکە خۆی دەسەپێنێت، ئایا لە (کات بەدەری) پێوەری ناوەڕۆکی ڕاستی کردەوەکانی مرۆڤە؟ یان شیعرو نووسینو بیرکردنەوە دەبن بەو پێوەرە؟

دێرشپیگل: بە لامەوە سەیرە، کە مرۆڤ لە هیچ سەردەمێکا نەبووە بە خاوەنی ئامێرەکان. لێرەدا من ئاماژە بۆ (The Magieian Apprentice) دەکەم. ئایا ئەمە ڕەشبینی دەرناخات کە دەڵێن مرۆڤ دەستەڵاتی بەسەر تەکنەلۆجیادا نەماوە[١٢]؟

هایدیگەر: من بە ڕەشبینی دانانێم. ڕەشبینیو ڕووناکبینی دوو هەڵوێستن ئێمە دیارییان دەکەین. لەسەرو ئەمەشەوە تەکنەلۆجیای سەردەم ئامێرێك نیەو پەیوەندی بە ئامێریشەوە نیە.

دێرشپیگل: بۆچی تەکنەلۆجیا داگیرمان دەکات؟

هایدیگەر: من لە داگیرکردن نادوێم. دەڵێم ڕێگەیەکمان نەدۆزیوەتەوە هەڵوێستی خۆمانی لە نێودا بەرانبەر تەکنەلۆجیا دیاری بکەین.

دێرشپیگل: لەوانەیە بۆچوونەکانم سادە بن، بەڵام چۆن بتوانین ئەوە ڕەت بکەین؟ بۆ ئێمە هەموو شتێك بە ڕێکوپێکی بەڕێوە دەچنو لە بەرهەمهێناندا گەیشتووینەتە لوتکە. مرۆڤی کۆمەڵگای تەکنەلۆجیا ژیانێکی باشی هەیە. ئێمە بە هۆی تەکنەلۆجیاوە گەشەمان کردووە. ئایا ئەو شتە چیە، کە دەستمان نەکەوتووە؟

هایدیگەر: هەموو شتێك بە ڕێکوپێکی بەڕێوە دەچێت. خۆهەڵخەڵەتاندنەکە لەوێدایە کە دەڵێن هەموو شتێك بەڕێوە دەچێت. ئەمەش هاندەرە بۆ بەخێرکردنی بەڕێوەچوونەکە تاکو تەکنەلۆجیا دەگاتە ڕادەیەك ڕەگوڕیشەی مرۆڤ لە ئاوو زەویدا





دەردەهێنێ. تۆ نەترسای کاتێك وێنەکانیان لەسەر مانگەوە ڕەوانەی زەوی کرد؟ ئێمە پێویستیمان بە چەکی ئەتۆمی نیە. ڕەگوڕیشەی مرۆڤ دەرهێنراوەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانمان بوون بە تەکنەلۆجیانە. ئەم ئەستێرەیە ئەو زەوییە نیە مرۆڤی لەسەر دەژی. ئەگەر لە یادت بێت ماوەیەك لە پێشتر گفتوگۆیەکم لەگەڵ (ڕێنەچار) ( Rene Char) کرد کە شاعیرێکی جەنگاوەرەو لە (پرۆڤێنس) دەژی. لە (پرۆڤێنس) بنکەی موشەیان داناو ناوچەکە لەگەڵیا شێوا. ئەو شاعیرە کە گومان لە سۆزو عاتیفەی بۆ هونەر ناکرێ گوتی، بوونی مرۆڤ بە ڕەگەوە هەڵکێشراوە، ئەگەر شیعرو بیر، دەستەڵات نەگرنە دەست ئەوا بوونی کۆتایی پێدێت.

دێرشپیگل: ئێمە دەمانەوێ لێرە (لەسەر زەوی) بین‌و بێگومان هەتاکو بژین لێرە دەبین. کێ دەڵێت چارەنووسی مرۆڤ لێرەیە؟ لەوانەیە مرۆڤ چارەنووسی نەبێت. لەوانەشە لێرەوە خۆی بە ئەستێرەکانی دیکە بگەیەنێت. ئەمەش ئێستا ڕوونادات بەڵام لە کوێدا نوسراوە چارەنووسی مرۆڤ لێرەیە؟

هایدیگەر: بە گوێرەی ئەزموونەکانی مرۆڤو مێژوو، یان بە لای کەمەوە بەو شێوەیەی من دەیبینم ئەوە دەزانم کە هەموو شتێکی مەزنو بنەڕەتی لەسەر ئەو ڕاستیە وەستاوە، کە مرۆڤ خاوەنی خاکەو لەناو کەلەپوورێکدا دەژی.

دێرشپیگل: بۆ تۆ ئەدەبی سەردەم دەستەڵاتێکی ڕووخێنەرە. زاراوەی (ڕووخێنەر) لێرەدا تووشی گرفتمان دەکات بە تایبەتی پاش ئەوەی سوپاس بۆ تۆ کە واتای هیچگەرایەتیت (Nihilism) ڕوون کردۆتەوە. جێگای سەرسوڕمانە دەستەڵاتی ڕووخێنەر بە ئەدەب دەدەین، کە تۆ بە بەشێك لە هیچگەرایەتی دادەنێیت.

هایدیگەر: حەزدەکەم ڕوونی بکەمەوە، ئەو ئەدەبەی من ئاماژەی بۆ دەکەمو لە بیری مندایە، بەو جۆرەی منیش لە واتای هیچگەرایەتی دەکۆڵمەوە هیچگەرانە نیە.

دێرشپیگل: تۆ دەڵێیت ئەم بزوتنەوەیەی ئەمڕۆ لە جیهاندایە ئێمە بەرەو تەکنەلۆجیا یان دەوڵەتێکی تەکنەلۆجی دەبات.

هایدیگەر: بەڵێ.

دێرشپیگل: باشە. ئایا تاك دەتوانێت كاریگەرێتی خۆی بەسەردا بسەپێنێ؟ فەلسەفە بەو كارە هەستێت یان فەلسەفەو تاك پێكەوە كاریگەرێتی خۆیان تۆمار بكەن؟

هایدیگەر: بە كورتی وەڵامت دەدەمەوە كە پاش بیركردنەوەیەكی دوورو درێژ لە لام پەیدا بووە. فەلسەفە ڕاستەوخۆ ناتوانێت بارودۆخی جیهان بگۆڕێت. ئەمەش بە تەنیا بۆ فەلسەفە نیەو شێوەكانی دیكەی بیركردنەوەش دەگرێتەوە. تەنیا خوایەك ئێمە ڕزگار دەكات. ڕێگەچارەی ئێمە خۆ ئامادەكردنە بە بیرو شیعرەوە بۆ هاتنی خوایەك یان نەبوونی خوایەك لەم سەردەمەدا، كە سەردەمی ڕووخانە.

دێرشپیگل: ئایا پەیوەندییەك لە نێوان بیركردنەوەی تۆو هاتنی ئەو خوایەدا هەیە؟ ئایا دەتوانین لە ناوەوەی خۆماندا بیر لەو خوایە بكەینەوە؟

هایدیگەر: ئێمە نایهێنینە ئێرە. بەڵام خۆمان ئامادەی هاتنەكەی دەكەین.

**دێرشپیگل: بەڵام دەتوانین یاریدەدەری هاتنەکەی بین؟**

هایدیگەر: خۆئامادەکردن یەکەم هەنگاوە. جیهان نابێت بەم شێوەیەی مرۆڤی تێدا دەژی بمێنێتەوەو بەبێ مرۆڤیش جیهان نیە. بەو شێوەیەی من لە واتای جیهان یان بوون تێدەگەم بۆ خۆدەرخستن پێویستی بە مرۆڤە. ناوەڕۆکی تەکنەلۆجیاش کە من بە (خزانە نێو چوارچێوە)ی دادەنێم، گاڵتەی پێدەکرێت. مەبەستم ئەوەیە مرۆڤ خزاوەتە نێو قاڵبەوەو لەژێر هەڕەشەکردنی دەستەڵاتی تەکنەلۆجیادا ناچارکراوە. دەستەڵاتێك مرۆڤ نەتوانێت دەستی بەسەردا بگرێت. لەژێر ئەم بارودۆخەدا دەگەیتە ئەو باوەڕەی کە کۆتایی بە فەلسەفە هاتووە.

**دێرشپیگل: لە پێشتر وا بیر لە فەلسەفە دەکرایەوە، کە بتوانیت ناڕاستەوخۆ، هەندێك جاریش بگرە ڕاستەوخۆ کاریگەرێتی خۆی بخاتەگەڕ. ئەگەر بیر لە ئەڵمانیەکان، وەکو (کانتو هیگڵو نیتشە) و لەسەرو ئەمانیشەوە (مارکس) بکەینەوە دەتوانین ئاماژە بۆ کاریگەرێتی فەلسەفە بکەین. ئایا**





مەبەستت ئەوەیە ئەم کاریگەرێتییە نەماوە؟ ئەگەر تۆ فەلسەفەی کۆن بە مردوو دابنێیت مەبەست لەوەیە کە ئەمرۆش بەلای کەمەوە فەلسەفە کۆتایی پێهاتووە؟

هایدیگەر: ئەگەر بە جۆرێکی دیکە بیربکەینەوە کاریگەرێتی ڕاستەوخۆ نابینین، بەڵام ناڕاستەوخۆ هەیە. بەم جۆرە بیرکردنەوە دەتوانێت جیهان بگۆڕێت.

دێرشپیگل: ببوورە، نامەوێت فەلسەفەزانی بکەم. بەڵام لێرەدا دەگەینە سنووری نێوان فەلسەفەو سیاسەت. تۆ دەڵێیت فەلسەفەو تاك ناتوانن گۆڕانکارییەکان..

هایدیگەر: .. خۆئامادەکردنەکەو چاوەڕوانکردنی هاتنی خوایەك یان نەبوونی ئەو خوایە شتێکی (هیچ) نیە. ڕزگارکردنی مرۆڤە لە خلیسکانی بەرەو ڕۆخانەی شتەکان، کە لە (بوونو کات)دا باسمکردووە. ئەمەش بەشێکە لە خۆئامادەکردنەکە.

دێرشپیگل: بەڵام ئەو هێزە پاڵنەرە لە دەرەوە پەیدادەبێت. لەبەر ئەمە ئەمرۆ بیرکردنەوە کاریگەر

نیە. ئەمە بۆچوونی کەسانی پێش سەردەمی ئێمەش بوو.

هایدیگەر: بەڵام کتوپڕ نا.

دێرشپیگل: لە پێشتر لەمەڕ کاریگەرێتی (کانتو هیگڵو مارکسی) دوایت. بەڵام هەندێك کاریگەرایەتی (لایبنیز) بەسەر بیری فیزیکی نوێوە دیارە، کە جێگاپەنجەی خۆی بەسەر جیهانی نوێوە جێهێشتووە. تۆ دەڵێیت ئەو کاریگەرێتیە لەمڕۆدا نابینرێت.

هایدیگەر: فەلسەفیانە نابینرێت. زانستەکان جێگەی فەلسەفەیان داگیرکردووە. بۆئەوەی باشتر لە کێشەی (کاریگەر) و (کاریگەرایەتی) تێبگەین دەبێت قوڵتر لە واتاکەی بکۆڵینەوە. ئەگەر لە پرنسیپاڵی هۆی پڕوتەواو (Snfficient Reason) تێبگەین دەبێت جیاوازییە بنەڕەتیەکان نێوان ڕوودانو هێزی پاڵنەرو زێدەتریو یاریدەدەرو ڕێگرو هاوکاری ڕوون بکەینەوە. فەلسەفە لەنێو زانستەکاندا، وەکو سایکۆلۆجیو لۆجیكو زانستی سیاسیدا تواوەتەوە.

دێرشپیگل: ئێستا چی جێگەی فەلسەفە دەگرێتەوە؟

هایدیگەر: (سایبەر نێتیکس) Cybernetics.

دێرشپیگل: یان ئەو کەسەی ئاسۆی بیرکردنەوەی فراوانە؟

هایدیگەر: بەڵام ئەو بیرکردنەوەیە فەلسەفە نیە.

دێرشپیگل: ئەی ئەوە چیە؟

هایدیگەر: بیرکردنەوەیەکی جیاوازە.

دێرشپیگل: ناویدەنێیت بیرکردنەوەی دیکە، دەتوانیت زیاتر بۆمانی ڕوون بکەیتەوە؟

هایدیگەر: تۆ کۆتایی نووسراوەکەی منت (پرسیار لەسەر تەکنەلۆجیا)، کە دەڵێت پرسیارکردن پەرستنی بیرکردنەوەیە، لە یادە[١٣]؟

دێرشپیگل: گوتەیەکی تۆم لە وانەکەت لەسەر (نیتشە) لە یادە کە ڕووناکبیرانەیە، دەڵێیت، (لەبەر ڕوودانی نزیکبوونەوە لە نێوان بیرکردنەوە فەلسەفیەکاندا وا دەبینین، کە بۆچوونی فەیلەسوفە مەزنەکان لە یەکدی بچن. ئەم لێکچوونە گرنگو بنەڕەتیەو تاکەکان لێی تێناگەنو هەریەکەیان بەوی دیکەوە خۆی گرێدەدات). لێرەدا وا دەردەکەوێت، بە بۆچوونی تۆ ئەم تەلارە فەلسەفیە ئێمەی گەیاندۆتە کۆتایی گەشتەکەمان.

هایدیگەر: گەیشتۆتە کۆتایی. بەڵام نەبووە بە شتێکی هیچ یان پوچەڵو لەم وتوێژەماندا ڕوخسارێکی دیکەی خۆی نیشانداوین. وانەگوتنەوەو نووسراوەکانی سی ساڵی ڕابردووم هەوڵدانێك بوو بۆ لێکۆڵینەوەی فەلسەفەی ڕۆژئاوا. گەڕانەوە بۆ بناغە مێژوویەکانی بیرکردنەوە، بیرکردنەوە لە ڕوانگەی ئەو پرسیارە کراوانەوە کە لە سەردەمی یۆنانەوە لە نەریت دانەبڕاون. من دەڵێم ئەو نەریتە میتافیزیکیەی لەگەڵ هاتنی (نیتشە)دا لەناوچوو، لە سەردەمی تەکنەلۆجیادا خزمەت بەخش نیە. ئەم سەردەمەش تازە دەستیپێکردووە.

دێرشپیگل: دوو ساڵ لە پێشتر، لەگەڵ خواناسێکی بودیدا گوتت (بیرکردنەوەیەکی نوێ لە توانای چەند تاکە کەسێکدایە). ئایا مەبەستت ئەوەیە هەموو کەسێك ناتوانێت بیرکردنەوەی نوێ دابهێنێ؟

هایدیگەر: بە هەموو واتایەکەوە خاوەنی بن یان بتوانن ئەو جۆرە بیکردنەوەیان لا پەیدا بێت.

دێرشپیگل: بەڵام تۆ لەگەڵ ئەوەدا ڕوونت نەکردەوە چۆن ئەو بیرکردنەوەیە بەرەو ڕاستەقینە دەڕوات.

هایدیگەر: ناتوانم ڕوونی بکەمەوە. نازانم چۆن ئەو بیرکردنەوەیە کاریگەرێتی خۆی دەنوێنێ. لەوانەیە بیرکردنەوە گەیشتبێتە ئەو قۆناغەی بێدەنگی بۆ مانەوەی بیرکردنەوەو گیرنەخواردنی لە شوێنی خۆیدا پێویست بێت. یان پێویستی بە سێ سەدە بێت تاکو کاریگەرێی خۆی بخاتەگەڕ.

دێرشپیگل: ئێمە سێ سەدە ناژین تاکو کاریگەرێتیەکە ببینین. بەڵام ئەمڕۆ ناتوانین بێدەنگ بمێنینەوە. ئێمەی سیاسی یان نیمچە سیاسیو ڕۆژنامەنووسو هاوڵاتیو.. هتد دەبێت بڕیاری خۆمان بدەین خۆمان لەگەڵ ئەو ڕژێمەدا کۆك بکەین، کە لەگەڵیا دەژین، خۆمان بە گۆڕان ڕابهێنین. دەبێت چاوەڕوانی شۆڕش یان چاکسازی بین. داوای یارمەتی لە فەیلەسوف دەکەین بەڵام تۆ یارمەتیمان نادەیت.

هایدگەر: بەڵێ. من ناتوانم یارمەتیت بدەم.





دێرشپیگل: ئەمە نابێتە هاندەر بۆ ئەوانەی فەیلەسوف نین.

هایدیگەر: من ناتوانم، چونکە پرسیارەکان گەورەنو لەگەڵ واتای دەوری بیرکردنەوەش ناکۆك رادەوەستن، ئەگەر وەکو جاران بە زۆر چەند حوکمێکی ئەخلاقی بەسەردا بچەسپێنین. لەوانەیە بۆ لایەنی شاراوەی بێ -بیرۆکەیی دەستەڵاتی تەکنەلۆجیای جیهانی جۆرە بیرکردنەوەیەکمان لە لایە، کە بتوانێت جێگای بێ- بیرۆکەیی ئەوە دەستەڵاتە تەکنەلۆجیە بگرێتەوە.

دێرشپیگل: تۆ خۆت ناخەیتە ڕیزی ڕێگاناسەکان، ئەگەر خەڵکی بیانەوێت ڕێگەیان نیشاندەی؟

هایدیگەر: نەخێر. من ڕێگەیەك بۆ گۆڕانکارییەکی کتوپڕو ئێستای جیهان ناناسم کە گونجاو بێت. بەڵام لەو باوەڕەدام ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەی باسی دەکەم ئاگابوونەوەیە بۆ خۆئامادەکردنەکەی لە پێشتر ئاماژەم بۆ کرد.

دێرشپیگل: وەڵامەکە ڕوونە. بەڵام ئایا بیریار دەبێت بڵێت ئێوە سێ سەد ساڵ چاوەڕوان بن، تاکو گۆڕانکارییەك ڕوودەدات؟

هایدیگەر: کێشەکە لە چاوەڕوانی ڕووداوەکە بۆ سێ سەد ساڵ نیە. بیرکردنەوە لە داهاتوودایە (بەبێ ئەوەی خۆت بە پێغەمبەر دابنێیت)، ئەمڕۆ بیری لێدەکرێتەوەو لە سەردەمێکی دیکەدا سەرهەڵدەدات. بیرکردنەوە بزاڤێکی سیستو ناچالاك نیە، چالاکیەکە، کە لەگەڵ جیهاندا دەدوێت. بە بۆچوونی من یا باشتر وایە بڵێم جیاوازی میتافیزیکی نێوان بیردۆزو پراکتیك یان ڕۆڵی بیرکردنەوە بەم جۆرە تێدەگەم. دەتوانم ئاماژە بۆ نووسراوەکەم (بیرکردنەوە چیە؟). کە لە ساڵی ١٩٥٤ بڵاوکرایەوە، بکەم.. بە داخەوە ئەم نووسراوەم لە هەموو نووسراوەکانی دیکەم کەمتر خوێندراوەتەوە[١٤].

دێرشپیگل: با بۆ سەرەتای باسەکەمان بگەڕێینەوە. ئایا دەشێ بڵێین ناسیۆنالیستی سۆشیالیزم، لە لایەکەوە دەستەڵاتێکی ناکۆك‌و دژوەستاوە بەرانبەر جیهانگەری‌و لە لایەکی دیکەوە خراپترین‌و زەبوونترین دژوەستانە بەرانبەر تەکنەلۆجیاو مرۆڤی سەردەم؟ وا دەردەکەوێت ئەزموونی تۆ لە ژیانا جیاوازە. هەندێك جار لەو کێشەیە دەدوێت کە پەیوەندی بە ناوەڕۆکی





فەلسەفەکەتەوە نیە. بۆ نموونە، وەکو ئەو چەمکانە (وڵات)، (ڕەگوڕیشە) و هەندێکی دیکەش. چۆن تەکنەلۆجیای جیهانگەری لەگەڵ (وڵات)دا کۆك دەبن؟

هایدیگەر: من وا بۆ کێشەکە ناڕۆم. بە بڕوای من تۆ تەکنەلۆجیا بە ڕەها دادەنێیت. من بوونی مرۆڤ لەنێو جیهانی تەکنەلۆجیدا بە ناچار دانانێم، کە نەتوانێت خۆی ڕزگار بکات. من ڕۆڵی بیرکردنەوە، بە هەموو کەموکوڕیەکانیەوە لەوێدا دەبینم، کە بتوانێت بە گونجاوی پەیوەندی لەگەڵ ناوەڕۆکی تەکنەلۆجیا هەبێت. بەڵام هەڵگرانی ئەو بیروباوەڕە بیرکردنەوەیان تەسکترە لەوەی بتوانن ئەو پەیوەندییە ببەستن. ئەمەش ماوەی سێ سەدەیە بە بەردەوامی دەڕواو وەکو خۆی ماوەتەوە.

دێرشپیگل: کەوابو ئەمەریکییەکان، ئەو پەیوەندییەیان دروست کردووە؟

هایدیگەر: ئەوانیش نەیانتوانیوە پەیوەندییەکە ببەستن. ئەوان کەوتوونەتە نێو داوی بیرکردنەوەی (پراگماتیزم)، کە بانگەشەی کارکردنو داگیرکردن دەکات. هاوکات ڕێگەی بیرکردنەوە لە تێگەیشتن لە

چیەتی لەنێو داوی پراگماتیزمو پۆزەتیڤیزم دراوە. کێ لەو باوەڕەدایە ڕۆژێك لە ڕوسیا یان لە چین بیرکردنەوەیەك سەرهەڵدەدات مرۆڤ بە ئاگا بهێنێتەوەو پەیوەندی سەربەستانە لەگەڵ تەکنەلۆجیا ببەستێت؟

دێرشپیگل: ئەگەر کەسێ خاوەنی ئەو بیرکردنەوەیە نەبێتو فەیلەسوفیش پێمان نەڵێت..

هایدیگەر: من بڕیار نادەم تاکو چ ڕادەیەك هەوڵی بیرکردنەوە دەدەمو ئەنجا لە داهاتوودا چۆن پێشوازی لێدەکرێتو گۆڕانکارییەکان ئافەرید دەکات. لە ساڵی ١٩٥٧ گوتارێکم لەسەر دەوری زانکۆ لە زانکۆی فرایبۆرگ بە ناوی The Principle of Identity خوێندەوە.

لەوێدا بە چەند هەنگاوێك ڕوونکراوەتەوە چۆن ئەزموونێکی ئاگامەندانە لەگەڵ تەکنەلۆجی جیهانیدا مرۆڤ زیاتر لە جیهانەوە نزیك دەکاتەوە. بیرکردنەوەم پەیوەندییەکی قوڵی بە شیعری (هۆڵدەرلن)ەوە هەیە.





بۆ من (هۆڵدەرلن) ئەو شاعیرەیە، کە خۆی بە داهاتوو دەگەیەنێت، چاوەڕوانی هاتنی خوایەکەو بە تەنیا شاعیرێکی بەر توێژینەوەی ئەدەبی نیە[١٥].

دێرشپیگل: لە وانەکانتا لەسەر (نیتشە) دەڵێیت (ئەو ناکۆکیە ناسراوو بەربڵاوەی لە نێوان (دیۆنۆسیس) و (ئەپۆلۆ)دا یان لە نێوان سۆزی پیرۆزو نوێنەری بە ئاگادا هەیە، یاسایەکی شاراوەو نادیاری مێژووی چارەنووسی ئەڵمانیەکانە. پێویستە خۆمان بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە بکەین خۆمانی تێدا دروست دەکەین. ئەم ناکۆکییە بۆ توێژینەوەی کەلتور بەستێنی نیە. لەگەڵ ناکۆکیەکەدا (نیتشەو هۆڵدەرلن) هێمای پرسیار لە بەردەم ڕۆڵی ئەڵمانیەکان لە هەڵسوڕانی مێژوودا دادەنێن. ئایا ئێمە لەو هێمایە تێدەگەین؟ ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە ئەگەر تێنەگەین مێژوو تۆڵەمان لێدەسەنێت). نازانم کەی ئەمەت نووسیوە، لە بیرم بێت ساڵی ١٩٣٥ ە.

هایدیگەر: ئەمەی خوێندتەوە بەشێکە لە وانەکەم بە ناوی The Will to Power as Art دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٣٦-١٩٣٧، لەوانەش دوای ئەو ساڵە نووسرابێت.

دێرشپیگل: دەتوانیت لەسەر ئەو خاڵە بدوێیت؟ چونکە ئێمە لە شتێکی هەمەکییەوە بۆ داهاتوویەکی کۆنکرێتی لە مێژووی ئەڵمانیەکان دەبات.

هایدیگەر: بەم شێوەیە واتای ئەو بەشەی خوێندتەوە ڕوون دەکەمەوە. لەو باوەڕەدام ئامادەکردنەکە لە هەمان شوێندا ڕوودەدات، کە تەکنەلۆجیای مۆدێرن تیایدا سەقامگیر بووە. لەوێدا ڕوونادات، کە باوەڕی (زێن- بودیزم) یان ئەزموونێکی ڕۆژهەڵاتی دەستەڵاتی بەسەردا دەگرێت. ئەمڕۆ پێداویستیەك بۆ سەرهەڵدانی بیرکردنەوە لە ئارادایە. ئەو بیروباوەڕە لەنێو نەریتی ئەوروپادا سەرهەڵدەدات.

دێرشپیگل: ئایا لەوێدا سەرهەڵدەدات، کە تەکنەلۆجیا تیایدا سەقامگیر بووە.؟ یان وەکو دەڵێیت..

هایدیگەر: .. بەو شێوەیەی (هیگڵ) باسی دەکات دەبێت بەرزێتی وەرگرێ، نەك بخرێتە لایەکەوەو لە مرۆڤەوە دووربێت.

دێرشپیگل: تۆ ئەم ڕۆڵە بە ئەڵمانیەکان دەدەیت؟

هایدیگەر: بەڵێ، لەو ڕووەوە کە من لەگەڵ (هۆڵدەرن) دایەلۆگ دەکەم.

دێرشپیگل: ئایا ئەڵمانیەکان ئەو ڕۆڵە دەبینن؟

هایدیگەر: من لەگەڵ بیرکردنەوەدا لە پەیوەندی بنەڕەتی نێوان زمانی یۆنانیو ئەڵمانی دەکۆڵمەوە. پاش ئەوەی دەڕوانم فەرەنسیەکان ئەم پەیوەندییەم زیاتر لا ئاشکرا بووە. ئەوان بیردەکەنەوەو بە ئەڵمانی دەدوێن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ناتوانن بە زمانی خۆیان بەو کارە هەڵسن.

دێرشپیگل: ئایا لەبەر ئەمەیە تۆ توانیوتە کاریگەرێتی بەسەر وڵاتە ڕۆمانسیەکانەوە یان فەرەنسا بگێڕێیت؟

هایدیگەر: کاتێك کێشەی بوون دێتە پێشەوە، ئەوان ناتوانن لە سەردەمەکەیاندا بەو عەقڵیەتە مەزنەیانەوە لە واتاکەی تێبگەن. ناتوانرێت بە تەواوی، وەکو وەرگێڕانی پارچە هۆنراوەیەك، تەرجومەی بیرکردنەوە بکرێت. بەڵام بە لای کەمەوە نزیکبوونەوە لە واتاکەی پێویستە. بەڵام لە کاتێکدا کە وەرگێڕانێکی (حەرفی) دەکرێت واتاکەش لەگەڵیا دەگۆڕێت.

دێرشپیگل: ئەم مەسەلەیە پەرێشانمان دەکات.

هایدیگەر: من پەرێشانیەکە بە جیدی وەردەگرم. بیر لە ئاکامە گرنگەکانی گۆڕانکارییەکان بەو شێوەیەی بیرکردنەوەی یۆنانی تێدا تێدەپەڕێتو وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ڕۆمانیو لاتینی دەکەمەوە. ئەمەش کۆسپو تەگەرەی تێگەیشتنی واتای زاراوە سەرەتاییەکانە لە یۆناندا بەکارهێنراون.

دێرشپیگل: پرۆفیسۆر. پێویستە ڕووناکبین بین لەوەی دەتوانین بە تەواوی بیرەکانمان بۆ سەر زمانێکی دیکە وەرگێڕین. ئەگەر ڕووناکبین نەبین دەکەوینە بەر هەڕەشەی ناوچە گەرایەتییەوە.

هایدیگەر: ئایا تۆ جیاوازی نێوان بیرکردنەوەی یۆنانیو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بە ناوچە گەرایەتی دادەنێیت؟ پیتە بازرگانیەکان لە هەموو زمانێکدا بەکاردێن. زانستەکان (زانستە سروشتیەکانو فیزیای ماتماتیکی وەکو زانستێکی بنەڕەتی) وەرگێڕاونەتە سەر زمانەکانی جیهان، دەتوانین بڵێن هەموو جیهان بەو زمانە ماتماتیکیە دەدوێت. ئێمە لێرەدا مامەڵە لەگەڵ توێژینەوەیەکی بەرفراوانو دژواردا دەکەین.

دێرشپیگل: ئەمە بەشێکە لە گرفتەکە. دڵنیام زیادەڕۆییمان نەکردووە ئەگەر بڵێم لەنێو قەیرانی ڕژێمی دیموکراتی پەرلەمانیدا دەژین. ئەم ڕژێمە بۆ ماوەیەکی درێژ بە تایبەتی لە ئەڵمانیادا ماوەتەوە. لە وڵاتانی دیکەش، کە خاوەنی نەریتی دیموکراتی کۆنترن، وەکو بەریتانیاو ئەمەریکا، قەیرانەکە دەژی. لە فەرەنسا لە کێشەی قەیران دەرچووە. پرسیارەکەم لێرەدا ئەوەیە ئایا پێویست ناکات بیریار ئاماژەی ڕژێمی ئەم ڕژێمەمان بۆ بکات، (ئەو ڕژێمە چۆن دەبینرێت) چ جۆرە چاکسازییەك بکرێت (ئەو چاکسازییە چۆن سەرهەڵدەدات)؟ ئەگەر گۆڕانکاری ڕوونەدات لە چی بارودۆخێکدا دەمێننەوە. کاتێك گۆڕانەکە دەکەوێتە ژێردەستەڵاتی کەسێکەوە کە فەیلەسوف نیە تووشی چ کارەساتێکمان دەکات؟ ئایا پێویست ناکات فەیلەسوف پەیوەندی تاکەکانو کۆمەڵو تەکنەلۆجیاکان بۆ دیاری بکات؟ ئایا نابێت ئاماژەی بۆچوونەکانی بۆ ژیان بکات؟ ئایا دەوری فەیلەسوف (کەمیش بێت) لە کۆمەڵدا کەم نابێتەوە ئەگەر بەو کارە هەڵنەستێت؟





هایدیگەر: وەکو من بۆی دەچم، تاکە کەسێك ناتوانێت (هەموو) جیهان بخاتە ژێر دەستەلاتیەوەو بە دوای ڕێگەچارەدا دەگەڕێ. ئەگەر ئەو کەسە جیدی بێت زۆر لە بیرکردنەوە دەکات ڕێگەچارەکەی بۆ بدۆزێتەوە. بەلام ئەو چ جۆرە دەستەلاتێك بە خۆی دەدات؟ لە جیهانی بیرکردنەوەدا داکۆکیکردنی دەستەلات نیە. پێوەری (بیرکردنەوە) لە بیرکردنەوەیدایە. ئەمەش دەبێت بخرێتە بەرپرسیارکردنو لەسەر پەیوەندی نێوان زانستەکانو فەلسەفی بکۆڵینەوە، چونکە لایەنی تەکنیکیو سەرکەوتنی زانستەکان بیرکردنەوەی فەلسەفیانەی خستۆتە پەراوێزەوە. بیرکردنەوە دژوار بووە.

بیرکردنەوە تووشی نامۆیی بووە. بیرکردنەوە دەبێت بە دوای وەلامی پراکتیکی پرسیارەکاندا بگەڕێت، کە خەسڵەتی جیهانگەرانەیان هەیە. وەلامێك، کە پێویستیەکانی ڕۆژانە بە دوایدا وێڵن.

دێرشپیگل: پرۆفیسۆر، لە جیهانی بیرکردنەوەدا داکۆکیکردنی دەستەلات نیە، کەوابوو سەیر نیە هونەری ئەمڕۆ ناتوانێت دەستەلاتی خۆی





بسەپێنێت. هاوکات تۆ هونەر بە ڕووخێنەر دادەنییێت. هەندێك جار هونەری سەردەم خۆی بە ئەزموونگەری دادەنێت. بەرهەمە هونەرییەکان هەوڵدانە..

هایدیگەر: پێم ناخۆش نیە فێرم بکەیت.

دێرشپیگل: ... هەوڵدانە (لە سەرهەڵدانیاندا) لە تەنیا بوونی مرۆڤی سەردەمدا. لەنێو سەد هەوڵداندا، یەکێکیان کاریگەرێتی خۆیان دەردەخەن.

هایدیگەر: ئەمە پرسیارێکی گەورەیە، هونەر لە کوێدا وەستاوە؟ چی جێگایەکی بۆ خۆی داگیر کردووە؟

دێرشپیگل: ئەوەی تۆ لە هونەری داوادەکەیت لە بیرکردنەوەی داواناکەیت.

هایدیگەر: من داوای هیچ لە هونەر ناکەم. پرسیارکردن سەبارەت جێگای هونەر دێتە پێشەوە.

دێرشپیگل: ئەگەر هونەر جێگای خۆی نەکاتەوە چۆن دەبێت بە ڕووخێنەر؟

هایدیگەر: باشە، واز لەو باسە بهێنە. من دەمەوێ بڵێم، نایبینم چۆن هونەر ڕێگایەك بۆ ئێمە

کە لەنێو تاریکیدا بەجێماوین، دەبینێتەوە، یان چۆن هونەر چیەتی هونەرمان پێدەناسێنێت.

دێرشپیگل: هونەرمەندیش هەست بە نامۆبوون دەکات. لەوانەیە بابەتێکی جوان ببینێو بڵێت، دەتوانرا شەش سەد ساڵ، سێ سەد ساڵ یان سی ساڵ لەمەوپێش بکرایە بە تابلۆ، بەڵام ئەو ئێستا ناتوانێت ئەو تابلۆیە بکات، چونکە دەبێت بە لاساییکەر (هانس ڤان مێرگنیش Hans van Meergeren) بە باشترین هونەرمەند. بەڵام ئەمە ڕاست نیە. لەبەرئەمە هونەرمەند، نووسەرو شاعیر وەکو بیریار تاکو کەی دەتوانن چاوی خۆیان بگرن؟

هایدیگەر: ئەگەر پەیوەندی نێوان فەلسەفەو شیعر بخرێتە نێو قەوارەی (کەلتووری پیشەسازییەوە) بەراوردەکە دروستە. بەڵام ئەگەر بە تەنیا بیری (پیشەسازی) نەخرێتە ژێر پرسیارو کەلتووریش هەڵنەسەنگێنی ئەوا لێپرسینەوەی ڕۆڵەکە بۆ گۆڕانکاری دەدەین بە بیرکردنەوە بەبێ ئەوە لە دۆخە گیرخواردووەکەی تێبگەین. گیرخواردوویی بیرکردنەوە بە دیدی من ئەوەیە، کە هیچ بیریارێك ئەوەندە خۆی بە گەورە نابینێت، تاکو

بیرکردنەوە لە ئاستی جیهاندا ڕابگرێ‌و بیخاتە گەڕ. لە سەردەمی ئێمەدا بابەتی بیرکردنەوەکەمان گەلێك گەورەیە. هەڵبەتە دەتوانین تولەڕێگەیەك نەك ڕێگایەکی دوور بۆ خۆمان بدۆزینەوە.

دێرشپیگل: پرۆفیسۆر هایدیگەر، زۆر سوپاس بۆ گفتوگۆکەت.





## پەراوێزەکان:

١-Sturm Abteilung Storm Troop.

٢- Martin Heidegger, Was ist Metaphysik? 9. Aufl. (Frankfurt: Klostrer- mann, 1965), pp. 24-5. Engl. Trans: "What is Metaphysics?" trans. R.F.C Hull and A. Crick in Existence and Being, ed. W. Brock (London: Vision Press, 1956), p. 356. With the exception of this passage, we have used the existing English translations of the works of Heidegger referred to in the interview.

٣- Martin Heidegger, Die Selbstbehauptung der deutschen Universitat (Breslau: Korn, 1933).

٤- Nationalsoziastische Deutsche Arbeiterpartei (the National Social- ists or "Nazis").

٥- Martin Heidegger, Unterwegs sur Sprache (Pfullingen: Neske, 1959), p. 269. Engl. Trans. On the Way to Language, trans. Peter Hertz (New York: Harper & Row, 1971), pp. 199-200.

٦- Albert Leo Schlageter (1894-1923), shot by the French for his role in the resistance to the French occupation of the Ruhr.

٧-Sicherheitsdients, the Security Service.

٨- Der Spiegel provides the following note: Professor Gerhard Ritter, at that time full





Professor of Modern History in the Univ. of Freiburg, was imprisoned on Nov. 1, 1944 in connection with the assassination attempt on Hitler on July 20, 1944 and was freed by the allied troops only on April 25, 1945. The historian became Professor emeritus in 1956 and died in 1967, (Form Carl Goerdeler und die deutsche

.(Widerstandsbewegung

It was in order to utilize the last reserves of "-٩

his manpower that Hitler had created a new fighting force of hurriedly- trained civilians- the Volkssturm- into which all able- bodied males between 16 and 60 were compulsorily drafted". Richard Grundberger, Germany 1918-1945 (New

.York: Harper & Row 1964), p. 181

Martin Heidegger, Einfuhrung in die -١٠

Metapbysik, 2. Aufl. (Tu- bingen: Max Niemeyer, 1958), p. 152. Engl. Trans: An Introduction to Metaphysics trans. Ralph Mannheim (Garden

.City: Doubledaym 1961), p. 166

For Joan Stambaugh's translation of "Ge--١١

Strell" as "frame" see her introduction to Martin Heidegger, Identity and Difference (New York:

.Harper & Row, 1959), p. 14, n.1

.A poem by Goethe-١٢

Martin Heidegger, Vortrage and Aufsatzen -١٣

.Cpfullinger: Neske, 1954), p. 44

Martin Heidegger, Was Heisst Denken? 2. -١٤

Aufl. (Tubingen: Niemeyer, 1961). Engl. Trans.





What is Called Thinking? Trans. F. Wieck and J. .(Glenn Gray (New York: Harper, 1968

.See Supra, n. 11-١٥

Heidegger's guess is right; cf. Martin -١٦ Heidegger, Nietzsche (pfullingen: Neske, 1961), B. .I, p 124





